گونیللا لوندگرێن و شەشتین گیدفۆش

# نێلسۆن ماندێلا

**ئەو کوڕەشوانەی بوو بە سەرکۆمار**

**وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە:**

**فەرهاد شاکەلی**



ناوی کتێب: نێڵسۆن ماندێلا – ئەو کوڕەشوانەی بوو بە سەرکۆمار

نووسینی: گونیللا لوندگرێن و شەشتین گیدفۆش

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: فەرهاد شاکەلی

بڵاوکراوەی ئاراس – ژمارە: ٩٣٥

دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: ئاراس ئەکرەم

بەرگ: مریەم موتەقییان

چاپی یەکەم – ٢٠٠٩

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان لە هەولێر ژمارە ٢٥٧٨ی ساڵی ٢٠٠٩ی دراوەتێ



# پێشواژە

کاتێ نێڵسۆن ماندێلا هێشتا لە بەندیخانەدا بوو
دەستی کردە نووسینی کتێبێك لەبارەی ژیانی خۆیەوە.
ئەو بە نهێنی خەریکی نووسین بوو،
لاپەڕەکانی کتێبەکەی لە حەوشەی بەندیخانەکەدا دەخستە چاڵەوە.
بەڵام پاسەوانەکان کاغەزەکانیان دۆزییەوە و بردنیان.
کە نێڵسۆن ماندێلا ئازادیی وە دەست هێنایەوە، ئەوسا
توانیی لە نووسینی کتێبەکەی ببێتەوە.
ئێمە لەو کتێبەوە زۆر شت فێر دەبین.

ئێمە چووین بۆ گوندەکەی ساڵانی منداڵیی، تا شتی زیاتر بزانین.
لەوێ چاومان بەو زنجانە کەوت کە نێڵسۆن ماندێلا باسیان دەکات.
ئەو دیمەنە جوانەمان بە دڵ بوو.
لەگەڵ پیر و جواندا قسەمان کرد و
داوامان لە منداڵی ئەفریقای باشوور کرد
چەند نیگارێك بۆ ئەم کتێبە بکێشن.

زۆر لەوانەی قسەمان لەگەڵ کردن دەیانگوت:
– بە سایەی نێڵسۆن ماندێلاوە شەڕی ناوخۆ ڕووی نەدا.

نێڵسۆن ماندێلا دەڵێ:
– ئەگەر مرۆڤ بتوانن خۆیان فێری ڕق بکەن،
کەواتە دەتوانن خۆیان فێری خۆشەویستییش بکەن. خۆشەویستی
سروشتیترە بۆ دڵی مرۆڤ.

ئەم کتێبە ئەویننامەیەکە بۆ ئەو پیاوەی ٢٧ ساڵ لە زینداندا بوو
بێ ئەوەی ببێتە مرۆڤێکی کینەدار.

گونیللا لوندگرێن و شەشتین گیدفۆش



# منداڵییەکی بەختیار

نێڵسۆن ماندێلا ڕۆژی ١٨ی تەمموزی ساڵی ١٩١٨ لە ئەفریقای باشوور لە دایك بوو. لە زنجێکدا، لە گوندێکی بچکۆلەی هەرێمی ترانسکای.

دەوروبەری دێیەکە هەموو شاخ و کێڵگە و دەشت بوو.

ئەو ناوە ئاوێکی زۆری هەبوو، ئاوی زەریاچە و ڕووبار و جۆگە. دارەکان هەمیشە سەوز بوون، تەنانەت بە زستانانیش.

باوکی نێڵسۆن سەرخێڵ بوو. نە خوێندنەوەی دەزانی و نە نووسین.

بەڵام پیاوێکی ژیر بوو کە هەم ئامۆژگاریی پاشایانی دەکرد و هەم جووتیارانیش. سیانزدە منداڵ و چوار ژنی هەبوون. ژنی سێیەمی دایکی نێڵسۆن بوو.



ئەو زنجەی نێڵسۆن ماندێلای تێدا گەورە بوو



ئەو چوار ژنە هەر یەکێکیان زەویی خۆی هەبوو، بە زنج و ولاخ و کێڵگەی تایبەتی خۆیەوە. زەوییەکان هەر یەك چەند کیلۆمەترێك لە یەکەوە دوور بوون.
باوکی نێڵسۆن بە نۆرە سەری لێ دەدان و هەر جارەی لای هەر یەکێکیان حەفتەیەك دەمایەوە.
نێڵسۆن منداڵی یەکەم و تاکەکوڕی دایکی خۆی بوو. ئەو لە گوندەکەدا بەختیار بوو، هەمیشە ژنان و منداڵانی دیکە دەورەیان دەدا.
پیاوان زۆربەی جار بۆ کارکردن لە ماڵ دوور دەکەوتنەوە، لە شاران، لە کانەکان یا لە کێڵگە گەورەکان کاریان دەکرد.
ژنان و منداڵان دێیەکەیان بە ڕێوە دەبرد. زەوییەکانیان پاك دەکردەوە، سەوزەیان دەچنی و ئاگایان لە ولاخەکان دەبوو.
زەوی هیی خۆیان نەبوو. لە دەوڵەت بە کرێیان وەردەگرت و هەموو ساڵێك کرێکەیان دەدا بە حوکوومەت.
لە گوندەکەی منداڵیی نێڵسۆندا چەندسەد کەسێك دەژیان. هەموو وەکیەك لە زنجی بازنەیی و بچووکدا، کە سەربانەکانیان بە پووش گیرابوون، دەژیان.
هەموویان بۆ خۆراکی خۆیان سەوزە و دانەوێڵەیان دەچاند و هەموویان کەموزۆر وەك یەکیان دەخوارد.
بەزۆری گەنمەشامی، هەرزن، کە جۆرەگەنمێکە، لۆبیا، فاسۆلیا و کوولەکەیان دەخوارد.
بە دەگمەن خەڵکی بێگانە ڕووی دەکردە گوندەکەیان.
نێڵسۆن دەیتوانی بۆ هەر لایەك بیەوێ، ڕا بکا؛ بەسەر ئەو تووڵەڕێیانەدا کە ژنان و منداڵانی پێپەتی کوتابوونیانەوە.

# ڕۆلیهلاهلا
## یەکەمین ناوی نێڵسۆن

کە نێڵسۆن لە دایك بوو، ناویان نا ڕۆلیهلاهلا.
ناوەکەی، بە زمانی خۆسا کە زمانی خۆیەتی و گەلی خۆسا پێی دەدوێن، مانای "شەڕانی" دەگەیێنێت.
کە نێڵسۆن منداڵ بوو هەمیشە پێیان دەگوت ڕۆلیهلاهلا.
ناوەکەی پڕ بە پێستی خۆی بوو، چونکە کوڕێکی هاروهاج و نەسرەوت بوو.
هەموو ڕۆژەکە لە دەرەوە دەبوو، لەناو کێڵگەکاندا، لەگەڵ کوڕانی تری گوندەکەدا.
هێشتا پێنجساڵان بوو کە بوو بە شوان.
کارەکەی ئەوە بوو ئاگای لە مەڕ و گوێرەکەکانی ماڵەکەیان بێت، بۆ ئەوەی، کە دەلەوەڕێن، بەملاو و بەولادا هەڵنەیێن.
ڕۆلیهلاهلا ئاژەڵەکانی خۆش دەویست.
کە لەگەڵیاندا بوو هەرگیز هەستی بە ترس نەدەکرد.
کە لە دەرەوە بوو، لەناو سروشتدا، ڕۆژەکانی زوو بەسەر دەچوون.
ڕۆلیهلاهلا بە دارلاستیك پەلەوەری ڕاو دەکرد و بە داو و قولاپیش ڕاوەماسیی دەکرد.
قولاپەکەی لە پارچەپۆلایەك دروست کردبوو.
ئەو و کورەشوانەکانی دیکە شەڕیان دەکرد و بە گۆچان بەر دەبوونە گیانی یەکتر.
سواری گوێرەکەکان دەبوون و
لە ئاوی ڕچیوی جۆگەکاندا مەلەیان دەکرد.
بە قوڕ ئاژەڵ و پەلەوەریان دروست دەکرد بۆ یاریکردن.
بە لقەداری وشك، عەرەبانەی بچکۆلەیان دروست دەکرد.
هەندێ جار یاریی شاخەوانییان دەکرد و لەسەر تاوێرە تیژ و بەردە لووسەکانەوە خۆیان هەڵدەهاوێشتە خوارەوە و هێندە ئێش بە پاشوویان دەگەیشت کە ئیتر نەیاندەتوانی دابنیشن.



که برسییان دەبوو هەنگوینی شاخیان کۆ دەکردەوە و بە دوای میوە و ئەو ڕەگوڕیشانەدا دەگەڕان کە بۆ خواردن دەشیان.
کە تینوویش دەبوون شیری گەرمیان ڕاستەوخۆ لە گوانی مانگاکانەوە دەخواردەوە.
ئێوارانیش کە تاریك دادەهات، کوڕەکان دەگەڕانەوە
بۆ لای دایك و خوشکەکانیان لە گوندەکە.
دایکی ڕۆلیهلاهلا چوار منداڵی هەبوون، سێیەکەی دیکە کچ بوون.
بێجگە لەوانیش ڕۆلیهلاهلا نۆ خوشکوبرای تری هەبوون.
ئەمانە منداڵی ژنەکانی تری باوکی بوون.
ئەمانە هەرگیز یەکتریان بە زڕبرا یا زڕخوشك دانەدەنا.
هەموو هەر خوشکوبرا بوون.
ماڵی ڕۆلیهلاهلا ژاوەی دەهات، لەبەر منداڵ ڕێ بەر ڕێدار نەدەکەوت،
ئەمانە منداڵ و کوڕەزا و کچەزای پوور و خاڵۆ و مامەکانی بوون.
– "پوورت لەجێی دایکتە و کوڕەکەیشی برای تۆیە"،
ڕۆلیهلاهلا هێشتا پێی نەگرتبوو، کە فێری ئەم قسەیە کرابوو.



دایکی سێ زنجی هەبوون.
یەکێکیان زنجی خواردنلێنان بوو.
ئەو لەوەیاندا، لەسەر کوانوویەك، خواردنی لێ دەنا.
لە زنجەکەی تردا سەوزە و دانەوێڵەی ئەنبار دەکرد،
زنجی سێیەمیش جێگەی خەوتن بوو.
دیوارەکانی زنجەکە لە قوڕ دروست کرابوون و سەربانەکەیش بە پووش گیرابوو.
زەویی ناوماڵەکەیش خۆڵی شارەمێرووولەی تێکدراو بوو،
ئەم خۆڵە بە تەپاڵەی مانگاکان سواخ دەدرا و ڕێك و لووس دەکرا.
لە زنجەکاندا هیچ تەخت و کورسییەك نەبوو.
ڕۆلیهلاهلا کە نانی دەخوارد لەسەر زەوی دادەنیشت.
شەوانیش ڕایەخێکی لەسەر زەوییەکە ڕادەخست و لێی دەنووست.
خەڵکی گوندەکە هەموو نە زۆر دەوڵەمەند بوون، نە زۆریش هەژار.
ژنان و کچان خواردنیان لێ دەنا، گسکیان دەدا و ئاو و ئاوردوو و سووتەمەنییان دەهێنا.
ئەوان هەر ئەو کارەیان دەکرد کە دایکەکانیان فێریان کردبوون.
پیاوان و کوڕانیش، هەر ئەو کارەیان دەکرد کە باوکانیان هەمیشە کردبوویان.





# خوێندنگە

ڕۆلیهلاهلا فێری ئەوە بوو کە گوێڕایەڵی کەسانی بەتەمەن بێت و ڕێزیان لێ بگرێت.
ئەگەر وای نەکردایە باوکی لێی دەدا.
ـ منداڵان دەبێ بێدەنگ بن و پرسیار نەکەن. گەورەساڵان وایان دەگوت.
منداڵی ژیر بەوە فێر دەبێ کە بە وردی تەماشا بکات و چاو لەو کەسانە بکات کە بەتەمەنترن.
ئێوارەیەك، کە ڕۆلیهلاهلا حەوتساڵان بوو، باوکی ویستی قسەی لەگەڵ بکات.
ـ کوڕم، تۆ دەبێ سبەینێ بچیتە خوێندنگە و دەست بە خوێندن بکەیت.
خوێندنگە!
هیچ کەسێکی خێزانی ڕۆلیهلاهلا، هەرگیز نەچووبووە خوێندنگە. ڕۆلیهلاهلا بیری کردەوە: ئەمە چۆن چۆنی دەبێ؟
ـ دەبێ جلوبەرگی چاك لە بەر بکەیت. باوکی بۆی ڕوون کردەوە.
ڕۆلیهلاهلا کوڵوانەیەکی سووری هەبوو، دەیدا بەسەر شانیدا و لە ناوقەدەوە دەیبەست.
ئەو تێگەیشت کە نابێ جلی وا لە بەر بکات،
بۆ خوێندنگە ئەمە ناکرێ!
بەڵام باوکی لەوە زیاتری ڕوون نەکردەوە.
لەباتیی ڕوونکردنەوە پانتۆڵێکی خۆی هێنا و دەرەلنگەکانی بڕی.
درێژییەکەی هەرچۆنێ بێت باش بوو، بەڵام بۆ ناوقەدی ڕۆلیهلاهلا گەورە بوو.
ئەوجا باوکی بەنێکی هێنا و پانتۆڵەکەی توند بە ناوقەدی ڕۆلیهلاهلاوە بەست.

که ڕۆلیهلاهلا ڕۆژی دواتر چووە قوتابخانە کەیفی بە خۆی دەهات،
شانازیی بە خۆیەوە دەکرد.
هیچ دەستەجلێك لە پانتۆڵە هەڵقاچراوەکانی باوکی جوانتر نەبوو!
یەکەم ڕۆژی خوێندنگە ژنەمامۆستاکە ناوی تازەی لە هەموو منداڵەکان نا.
خانمەمامۆستا وتی:
ـ ئیتر لە ئێستاوە نابێ ناوە ئەفریقاییەکانتان بە کار ببەن!
ڕۆلیهلاهلا ناو نرا نێلسۆن.
بەڵام بۆچی؟ خۆیشی نەیدەزانی و پرسیاریشی نەکرد. پرسیارکردن بێئەدەبی بوو.

"یەکەم خوێندنگەی نێلسۆن

″نێڵسۆن ماندێلا لە ترانسکەی گەورە بوو

نەك تەنیا ناو لە خوێندنگەدا ئینگلیزی بوو، بەڵکە زۆربەی ئەوەی منداڵان فێری دەبوون لەبارەی ئینگلستانەوە بوو.

خانمەمامۆستا بە هیچ جۆرێك گوێی بەوە نەدەدا کە منداڵان ئەفریقایی بوون و لە ئافریقا دەژیان.

ڕۆلیهلاهلایش گوێی نەدەدا.

بەهەرحاڵ تازە ناوی ″نێڵسۆن″ بوو، هەر شتێکی ئینگلیزییش سەرسامی دەکرد.

مرۆڤە سپییەکان بۆ ئەو وەك خودا وا بوون.

ئەو هەم سەرسامیان بوو، هەمیش لێیان دەترسا.





## سەبیل

شەوێك نێڵسۆن هەستی كرد دایكی نیگەرانە.
لە زنجی خەوتنەكە باوكی نێڵسۆن لەسەر پشت ڕاكشابوو، دەكۆكی.
ئەگەرچی نێڵسۆن منداڵێك بوو، بەڵام لەوە گەیشت كە باوكی هاتووەتەوە بۆ ماڵ بۆ ئەوەی لای ئەمان بمرێت.
باوكی پێشتر نەخۆشیی سەختی نەبووە و هەرگیز لە ژیانیدا نەچووبووە لای پزیشك، بەڵام ئێستا ئەوە چەند ڕۆژێك بوو لە زنجەكەی دایكیدا لێی كەوتبوو،
بێ ئەوەی جووڵەیەك یا قسەیەك بكات.
ژنە هەرە گەنجەكەیشی لە زنجەكە بوو. لە گوندەكەی خۆیەوە هاتبوو بۆ یارمەتیدانی دایكی نێڵسۆن.
شەوێكیان حاڵی باوكی پەرێشانتر بوو.
ـ سەویلێكم بۆ تێكە! بە ژنە گەنجەكەی وت.
هەردوو ژنەكە كەوتنە گفتوگۆ لەگەڵ یەكدی.
ـ سەبیلكێشان بۆ مرۆڤی نەخۆش باش نییە.
ژنەكان وایان وت و بڕیاریان دا بە قسەی مێردەكەیان نەكەن.
بەڵام باوكە وازی نەهێنا، دوایی
ژنە گەنجەكە قلیانەكەی بۆ پڕ كرد لە تووتن.
دایگیرساند و دایە دەستی.
باوكە بە بێدەنگی قلیانەكەی كێشا. ئیتر كۆكەی لێوە نەهات.
تاوێك قلیانی كێشا.
ئەوجا بەهێمنی مرد و هێشتا قلیانەكەی بە دەمەوە بوو.





گوندێك لە ترانسکەی

لە سەرەتادا نێلسۆن هەستی بە خەفەت نەکرد.
هەستی بە نەمانی باوکی نەکرد.
ئاخر ئەو بەوە ڕاهاتبوو کە باوکی تەقریبەن هەمیشە لە ماڵ نەبوو.
بەڵام ئێستا ئیتر ئەو مردبوو، ئەمەیش ژیانی نێلسۆنی بە تەواوی دەگۆڕی.
ڕۆژێك دایکی پێی وت کە دەبێ گوندەکە بە جێ بهێڵێ.
نێلسۆن نەیپرسی بۆچی،
پرسیاری ئەوەیشی نەکرد بۆ کوێ بار بکا.
بە بێدەنگی ئەو شتە کەمەی هەیبوو پێچایەوە و خستیە ناو باوڵێکی تەنەکەوە.
بەیانییەکی زوو کەوتنە ڕێ.
دایکی لە نواوە دەڕۆیشت و نێلسۆنیش بە دوایدا.
هەموو ڕۆژەکە بێدەنگ ڕۆیشتن.
نێلسۆن زۆر خەمبار بوو.
مردنی باوکی خەمهێن بوو،
بەڵام ئەمە خراپتر بوو.
بۆچی دەبوو لەو گوندەی کە زۆری خۆش دەویست بار بکات؟
ئیتر هەرگیز چاوی بە هاوڕێ و هاوگەمەکانی ناکەوێتەوە؟
لە هەموویشی خراپتر، دەکرا دایکی خۆشەویستی بیداتە ماڵێکی دی بە خێوی بکەن؟
ئایا ئیتر هەرگیز چاوی بەو سێ زنجە، کە ماڵی خۆی بوو، نەدەکەوتەوە؟

# گەورەجێ

بەو گەرمایە زۆر ڕۆیشتن.
نێڵسۆن و دایکی بەسەر چەندان کێڵگەدا، بەناو کۆمەڵێ دێی نائاشنادا ڕۆیشتن، بە گردەکاندا سەرکەوتن و دابەزین.
بەم ڕۆیشتنە ماندوو بوون، بەڵام یەکێکیان قسەیەکی لە دەم نەهاتە دەر. کەسیشیان ڕانەوەستا بۆ پشوودانێك.
ڕۆژ بەرەو ئاوابوون دەچوو کە گەیشتنە جێمەبەستی خۆیان.
نێڵسۆن بە حەپەساوی تەماشای دەکرد و ماندووبوونی خۆی لە بیر چووەوە.
دوو خانووی چوارگۆشە و حەوت زنجی بازنەیی لەوێدا هەبوون.
سەربانی خانووەکان گیا نەبوون، تەنەکە بوون!
زنجەکانیش وەك زنجەکانی دێیەکەی نێڵسۆن بچووك نەبوون.
ئەم زنجانە هێندە گەورە و هێندە سپی و پاك بوون لەبەر تیشکی هەتاوی ئێوارەدا دەبریسکانەوە.
نێڵسۆن هەرگیز شتی وەهای نەبینیبوو.
لە دەوروپشتی خانووەکان و زنجەکان داری ئەکاسیا،
دارخۆخ، دارسێو و سەوزە و گوڵ ڕوابوون.
لە کێڵگەکەدا بە لای کەمەوە پەنجا مانگا و ڕەنگە سێسەد سەر مەڕ دەلەوەڕان.
هەموو شتێ جوان و ڕێکوپێك بوو.
نێڵسۆن بیری لەوە دەکردەوە: دەوڵەمەندیی ئاوەها لە کوێوە دێت؟
دایکی نێڵسۆن بردبووی بۆ گەورەجێ لە تێمبولاند،
بۆ لای جۆنگینتابای سەرخێڵ کە فەرمانڕەوای ئەوێ بوو.
سەرخێڵ پێی دەگوترا (ڕێگێنت).
پیاوێکی بەدەستەڵات بوو، بەڵێنی دابوو چاودێریی نێڵسۆن بکات، کە ئێستا باوکی مردبوو.
ڕێگێنت وتی نێڵسۆن وەك کوڕی خۆم پەروەردە دەکەم و هیچ فەرق و جیاوازییەك لەنێوان ئەو و منداڵەکانی خۆمدا ناکەم.





ئەوان چییان خوارد، ئەمیش ئەوە بخوات، چییان لە بەر کرد، ئەمیش لە بەری بکات و منداڵەکانی خۆی هەرچییەکیان خوێند ئەمیش بیخوێنی.
دایکی نێڵسۆن گوێی لێ گرت. ئەو بێوەژنێکی هەژار بوو. چۆن دەیتوانی دەست بنێ بە ڕووی پیاوەتی و جوامێرییەکی وەهاوە؟

دایکە دوو ڕۆژ لە گەورەجێ مایەوە و ئەوجا
بەتەنیا گەڕایەوە بۆ گوندەکەی خۆی.
کە خواحافیزیی لە نێڵسۆن کرد نەگریا.
نە ماچی کرد و نە ڕێنوێنی.
هەر ئەوەندەی وت:
ـ نەکەی بێتاقەت بیت، کوڕەکەم! و
ڕووی لێ وەرگێڕا و ڕۆیشت.
نێڵسۆن ویستی بە دوای دایکیدا بڕوات.
ئەو هێشتا نۆساڵان بوو، باوکیشی تازە مردبوو،
ئەوەتا ئێستا دایکیشی دەیدایە دەست خەڵکێکی بێگانە.
وای هەست دەکرد تەنیایە و بە جێ هێڵراوە.

ڕێگێنت دەیویست نێڵسۆن لە ماڵە تازەکەیدا دڵخۆش بێت.
جلی تازەی بۆ کڕی و
ناردی بۆ خوێندنگەیەکی گەورەتر.
نێڵسۆن هەر زوو کۆمەڵێ کوڕی تازەی دۆزییەوە
جاروبار شەڕ و جاروباریش پێشبڕکێیان لەگەڵ بکات.
ئێستا ئیتر لەباتیی گوێرەکە، سواری ئەسپ دەبوو،
ئێوارانیش بە دەم گۆرانی و چەپڵەڕێزانی کچانەوە
هەڵپەڕکێی دەکرد.
ڕێگێنت چۆن بەڵێنی دابوو، هەر وایشی کرد؛
هیچ فەرق و جیاوازییەکی لەنێوان نێڵسۆن و
دوو مناڵەکەی خۆیدا نەدەکرد.
کوڕەکەی ڕێگێنت ناوی جەستیس بوو،
تەمەنی سیانزدە ساڵ بوو.
کوڕێکی باڵابەرز و قۆز بوو،
هەم ڕەگبییەکی چاکی دەزانی و هەم
فووتبۆڵ و سەمایش.
کچانی دێ هەموویان حەزیان لێ دەکرد.

جەستیس کوڕێکی ڕووخۆش، بەڵام تۆزێ پەرپووت بوو.
نێڵسۆن جیددی و ڕێکوپێك بوو.
ئەم دووانە هیچ لە یەك نەدەچوون.
بەڵام باشترین دۆستی یەکدی بوون.

# قەشە و ڕێگێنت

لە دێیەکەدا دوو پیاوی بەدەستەڵات هەبوون،
یەکێکیان ڕێگێنت بوو، ئەوی تریشیان قەشە ماتیۆلۆ.
ڕێگێنت لە گەورەجێدا بڕیاربەدەست بوو.
قەشەیش لە کڵێسەدا بڕیاری دەدا.
کڵێسا پزیشك و نەخۆشخانەی بۆ دێیەکانی
باشووری ئەفریقا دەهێنا.
منداڵان لە خوێندنگەکانی میسیۆنی
سەر بە کڵێسا دەیانخوێند.
نێڵسۆن بیری کردەوە: قەشە لە هەموو کەسێك بەدەستەڵاتترە،
تەنانەت ڕێگێنتیش گوێی لێ دەگرێت.
قەشە پیاوێکی کەڵەگەت و باڵابەرز بوو، دەنگێکی
گڕیشی هەبوو.
هەموو یەکشەممان کڵێسە بچکۆلەکەی پڕ دەبوو
لە خەڵکانێك گۆرانییان دەگوت و نوێژیان دەکرد.
هاواریان دەکرد:
– هۆسیانا! پیرۆز و باڵایە خوای گەورە.



″خوێندنگەیەکی میسیۆنێرەکان لە ئەفریقای باشوور، ١٩٢٥

نێلسۆن پێش ئەوەی بچێت بۆ گەورەجێ
تەنیا یەك جار چووبووە كڵێسە.
ئەوە ئەو كاتە بوو كە (تەعمید) كرا.
ئێستا ئیتر هەموو یەكشەممەیەك لەگەڵ خێزانە تازەكەیدا
دەچوو بۆ نوێژی بەكۆمەڵ.

بەردەوام خەڵك بۆ سەردان دەهاتن بۆ گەورەجێ.
ئەوانەی دەهاتن سەرخێڵەكان و
پیاوانی لادێ بوون، لێرە كۆ دەبوونەوە
بۆ چارەسەركردنی كێشەی جۆراوجۆر.
یا ئەوە بوو ماوەیەكی دوورودرێژ باران نەباریبوو،
گیا وشك بووبووەوە،
یا ئەوەی گایەك ڕای كردبوو،
یانیش كەسێك بزنێكی دزیبوو.

ئەم پیاوانە لە دەشتەكەی نزیك ماڵان كۆ دەبوونەوە.
ڕێگێنت بەخێرهاتنی دەكردن و كۆبوونەوەكەی دەست پێ دەكرد.
ئەوجا بۆ خۆی بێدەنگ دادەنیشت و بە وردی گوێی دەگرت.
پیاوان یەك بە یەك قسەیان دەكرد و كەسیش مافی ئەوەی نەبوو
قسە بە كەسێكی تر ببڕێت.
سەرخێڵەكانی دیكە زۆر جار ڕەخنەیان لە ڕێگێنت دەگرت،
بەڵام ئەو دیسانیش هەر بێدەنگ دادەنیشت.
بە دەموچاویدا هیچ دیار نەبوو چۆن بیر دەكاتەوە.



ئێوارەیەکی درەنگ، کە ڕۆژ ئاوا دەبوو، ڕێگێنت قسەی دەکرد.
ئەوسا کورتەیەکی قسەکانی هەر هەموویانی دەگێڕایەوە و
هەوڵی دەدا ئەوانەی بیروبۆچوونی جیاوازیان هەبوو یەك بخات.
ئەگەر ئەمەی پێ نەکرایە، دەبوو سەرلەنوێ کۆ ببنەوە و،
کۆبوونەوە بەردەوام دەبوو هەتا هەموویان ڕێك دەکەوتن.

پێش ئەوەی پیاوان بڵاوەی لێ بکەن
یەکێك چیرۆکی دەگێڕایەوە یا گۆرانیی دەچڕی.
گۆرانییەکانیش وەك چیرۆکەکان دووردرێژ بوون.
گۆرانییەکان لەبارەی پاشا و سەرخێڵەکانی جارانەوە بوون.
بەڵام هێندێ جاریش لەبارەی ئەو سەرخێڵانەوە بوون
کە ئێستا لەوێ ئامادە بوون.
ئەم جۆرە گۆرانییانە بێشەرمانە و وروژێنەر
بوون و گوێگران دەیاندایە هاڕەی پێکەنین،
هەم بە خۆیان و هەم بە یەکدی.

نێلسۆن زۆرجار لە کۆبوونەوەکاندا دادەنیشت و گوێی دەگرت.
بەتایبەت سەرخێڵێکی پیری خۆش دەویست، ناوی جۆیی بوو.
ئەوەندە پیر بوو کە پێستی چرچ و لۆچی گۆناکانی و ئانیشك و ئەژنۆکانی بە جۆرێ
شۆڕ بووبوونەوە دەتگوت پریاسکەی چەرمینن.
جۆیی ـ ی سەرخێڵ هاواری دەکرد و دەیگوت:
– مرۆڤی سپی وڵاتەکەمانی بردووە بۆ خۆی.
سپییەکان لەوبەری زەریاکانەوە،
بە خۆیان و تفەنگی ئاگرپژێنیانەوە هاتن و
وەك چۆن کەسێك ئەسپی کەسێکی تر دەبات،
ئاوەها خاکەکەمانیان برد!

نێلسۆن تووشی حەپەسان بوو.
ئاخر ئەو سپییەکانی بە خودا دەزانی.
پۆلیسەکانی دێیەکەی سپی بوون و
کابرای دوکانداریش سپی بوو.
لەوە بەولاوە نێلسۆن بەدەگمەن خەڵکی سپیی دەبینی.
ئایا ئەوان بەڕاستی وڵاتەکەی ئەمیان بردبوو؟
نێلسۆن هەستی دەکرد هەڵخەڵەتێنراوە.

## خەتەنە

کە نێڵسۆن گەیشتە تەمەنی شانزدەساڵان
ڕێگێنت بڕیاری دا، وتی تۆ تازە ئیتر گەورەیت و دەبێ خەتەنە بکرێیت.
پیاوێك کە خەتەنە نەکرابووایە
نە دەیتوانی ژن بهێنێت و نە زەویوزاری باوکی بە میرات بۆ دەمایەوە.
کەسێکی وا بە هەموو ژیانی بە کوڕێکی پێنەگەیشتوو دادەنرا.

بڕیار درا بیستوشەش کوڕ پێکەوە خەتەنە بکرێن.
ڕۆژی سەری ساڵ هەموویان کۆ کرانەوە و
بردنیان بۆ جێگەیەکی دوور و چەپەك لای ڕووبارەکە.
ئێوارەی پێش خەتەنەکردنەکە ژنان لە گوندەکانەوە
هاتن و گۆرانییان بۆ کوڕەکان چڕی و
کردیان بە چەپڵەڕێزان.
ژنان چەند دەنگیان لێ هەڵدەبڕی، کوڕەکان زیاتر دەورووژان و هەڵدەپەڕین،
تا لە دواییدا ترسیان هەر لە بیر نەما.

ڕۆژی دواتر، بەیانیی زوو، کە هێشتا دنیا هەر تاریك بوو
کوڕەکانیان دا لە بەر بۆ لای ڕووبارەکە.
لەوێ بەو ئاوە ساردە خۆیان شۆرد، سەر و پەتۆیان پێوە پێچان و
ئەوجا بردنیان بۆ جێگەیەکی پان و بەرین.
لەوێ باوکودایکیان و خزمەکانیان چاوەڕێیان دەکردن.
هەندێ پیاو تەپڵیان دەکوتا
ئەمجا بە کوڕەکانیان وت دەی لەسەر پەتۆکان دانیشن،
قاچ ڕاکێشن و گەڵتان بڵاو بکەنەوە،

لە خێوەتێکەوە پیرەپیاوێك هاتە دەرێ، چەقۆیەکی چەماوەی بە دەستەوە بوو.
لە بەردەم یەکەم کوڕدا لەسەر چیچکان دانیشت.
نێڵسۆن دەترسا؛ تۆ بڵێی بئێشێ؟
چەندیش ئێشی بهاتایە نەدەبوو پێشانی بدات.
چونکە ئەوە دەبووە مایەی شەرم و شوورەیی بۆ خۆی و بۆ کوڕەکانی تر و
بۆ خێزانەکەی و بۆ ڕێگێنت.
پیاو دەبێ بەرگەی ژان بگرێت. ئەو ئەمەی دەزانی.



کوڕەکان لە دەرەوەی زنجی
خەتەنەکردنەکە

کوڕی یەکەم قیڕاندی: بووم بە پیاو.
ئەمە مەعنای ئەوە بوو کە ئیتر خەتەنە کراوە.
ئەو ڕزگاری بووبوو بێ ئەوەی بقیژێنێ یا بگریێ.
نێڵسۆن لەرزی لێ هات.

هەمووی چەند چرکەیەکی مابوو نۆرەکە بگاتە سەری.
پیرەمێرد بە خۆی و چەقۆی دەستیەوە بەرانبەری لەسەر چۆك دانیشت.
ئەو لاواز و ڕەنگپەڕیو بوو.
نێڵسۆن ڕاست چاوی بڕییە چاوی
هەرچەندە ڕۆژەکە سارد بوو، دەموچاوی کابرا
خەڵتانی عەرەق بوو.

بێ ئەوەی یەك قسەی لە دەم دەربچێت، کابرا کێری
نێڵسۆنی گرت، پێشپێستەکەی ڕاکێشا و
چەقۆکەی لێ نا و بڕیی.
ئێش وەکوو برووسکەیەك چووە لەشی نێڵسۆنەوە.
تەماشایەکی خوارەوەی کرد و دیتی پارچەیەك لە پێشپێستەکەی بڕاوە.
نێڵسۆن ئێشێکی وای پێ گەیشت، کە لە بیری چووەوە بقیڕێنێ و بڵێ: بووم بە پیاو!
بەسەر سینگیدا شۆڕ کردەوە و شەرم دایگرت.



پیاوێك كە یارمەتیی دەدا لە نێڵسۆن هاتە پێشەوە.
پێشپێستەكەی نێڵسۆنی لە زەوییەكە هەڵگرت و
بەستی بە چمكێكی پەتۆكەیەوە.
ئەمجا هەندێ گەڵای وەك دەرمان خستە سەر كێری نێڵسۆن.
گەڵاكان بۆ ئەوە بوون خوێن و چڵكی برینەكە هەڵمژن.

ئێستا، ئەم جارە، نێڵسۆن ناوی سێیەمی پێ درا: دالیبهونگا.
ئەم ناوە لە ڕۆلیهلاهلا، كە ناوی كورپێنیی بوو،
یا نێڵسۆن، كە ناوی خوێندنگە بوو، گرنگتر بوو.
دالیبهونگا ناوی خەتەنەكردنەكەی بوو.
ئەمە مەعنای وا بوو كە ئیتر دەیتوانی لە كۆبوونەوەكاندا
وێڕای گەورەساڵانی دیكە دابنیشێ و بڕیار بدات.

كە هەموو كوڕەكان خەتەنە كران، چوون بۆ ناو زنجێك.
زنجەكە پڕ بوو لە دووكەڵ.
پیاوێك كۆتەرەداری تەڕی دەخستە سەر ئاگرەكە بۆ ئەوەی
زیاتر دووكەڵ بكات.
وتی ئەم دووكەڵە وا دەكات برینەكەتان زوور خۆش ببێتەوە.

نێڵسۆن لەگەڵ دوانزدە گەنجی دیكەدا لە زنجێكدا بوون.
دەبوو لەسەر پشت پاڵ بكەون، لاقێكیان
لەسەر زەوییەكە درێژ بكەن و لاقەكەی تریشیان بچەمێننەوە.
ئەمجا هەموو لەشیان كە تاشرابوو بە قوڕێكی سپی سواخ درا،
هەموو گیانیان بە جارێ بە قوڕەكە سواخ درا،
وایان لێ هاتبوو دەتگوت خێوی سپین.

یەکەم شەوی دوای خەتەنەکە، لە نیوەشەودا
کوڕەکانیان لە خەو هەڵساند.
پیاوێکی بەتەمەن پێی وتن دەبێ لە زنجەکە بچنە دەرەوە و لەو تاریکییەدا
پێشپێستەکەیان لە چاڵێکدا بنێژن.
نێڵسۆن بە هیچ جۆرێ نەیدەویست
بەو تاریکایی و سەرمایە بچێتە دەرێ.
لەگەڵ ئەوەیشدا بە گوێی پیاوەکەی کرد.

لە زنجەکەدا، تا برینەکانیان خۆش بوونەوە، کاتێکی زۆریان بە سەر برد.
کوڕەکان ڕادەکشان و پێکەوە قسەیان دەکرد و
هەندێ پیاوی بەتەمەنیش چاودێرییان دەکردن.
نێڵسۆن زۆر جار بیری دەکردەوە.
زۆربەی هاوڕێکانی دەیانگوت دەیانەوێ بچن بۆ جۆهاننەسبورگ،
گەورەترین شاری ئەفریقای باشوور.
ئێستا ئەوان ئیتر گەورەساڵ بوون و خۆیان دەیانتوانی بڕیار بدەن.
دەیانویست بچن لە کانەکاندا کار بکەن.
نێڵسۆن پێی وا بوو دەبێ شتێکی عەجایەب بێت
ئەویش دەیویست بچێ بۆ جۆهاننەسبورگ و لە کانێکی ئاڵتووندا کار بکات.

کە برینەکانیان سارێژ بوون، لاوەکان
چوون بۆ چۆمەکە و خۆیان شۆرد، لە قوڕە سپییەکە پاك بوونەوە و
ئەمجا بە قوڕێکی سوور چەوریان کردن.
دوای ئەوە ئاگریان بەر دایە زنجە پووشەکان.



نەیاندەهێشت کوڕەکان تەماشای زنجە
سووتاوەکەی خەتەنەکردن بکەن

## خوێندنگەی شەوانەڕۆژ

ئێستا ئیتر کوڕەکان بووبوونە پیاو.
لە ئەزموونەکەدا سەر کەوتبوون.
خێزانەکانیان و سەرخێڵەکان و ڕێگێنت قسەیان بۆ کردن و گۆرانییان بۆ وتن.
دیارییان وەرگرت.
نێڵسۆن دوو مانگا و چوار مەڕی بەر کەوت.
ئەوێك کە هەرگیز خاوەنی هیچ نەبووە، ئێستا
سەری قیت ڕادەگرت و کەیفی بە خۆی دەهات.
ئەو تازە ئیتر گەورەساڵ بوو.
دەیویست بچێت بۆ جۆهاننەسبورگ!

بەڵام نە نێڵسۆن و نە جەستیس
بۆیان نەبوو خۆیان بڕیاریان بدایە بۆ کوێ بچن و بیانەوێ ببن بە چی.
جەستیس دەبوو ببێ بە ڕێگێنت، ڕێك وەك باوکی خۆی.
ڕێگێنت دەمێك بوو ئەو بڕیارەی دابوو.
نێڵسۆن دەبوو ببێتە ڕاوێژکار و ئامۆژگاریی چاکی ڕێگێنت و پاشاکان بکات.
دەبوو بینێرن بۆ خوێندنگەیەکی شەوانەڕۆژ لەوبەری ڕووبارەکەوە.
خوێندنگەکە ئەوەندە لە گوندەکەوە دوور بوو کە نێڵسۆن
دەبوو هەر لەوێ بژی.

نێڵسۆن پێشتر هەرگیز نەچووبووە ئەوبەری ڕووبارەکە،
ئەو تەنیا شارەزای ژیانی دێ بوو
تەنانەت تا ئەو کاتە پێڵاویشی لە پێ نەکردبوو.

ئێوارەیەك ڕێگێنت جووتێ پێڵاوی تازەی بریقەداری دایێ و
ڕۆژی دواتر بە ماشێنەکەی خۆی بردی بۆ خوێندنگەی شەوانەڕۆژەکە.
لە ماوەی سەفەرەکەیاندا ڕێگێنت ئامۆژگاریی دەکرد:
دەبێ هەڵسوکەوتت جوان بێ،
تا خەڵکی ڕێزی گەلەکەمان بگرێت.
دەبێ هەمیشە گوێڕایەڵی بەڕێوەبەری خوێندنگە بیت!
ئەو پیاوێکی سپییە بەڵام یەکێکە لە ئێمە و
بە هەموو دڵی گەلی ئەفریکانی خۆش دەوێت.
ئەو پیاوە ئەفریکانێکی سپییە. ڕێگێنت ئەمەی بە جیددی وت.
نێڵسۆن بەڵێنی دا گوێڕایەڵ بێت.

لە خوێندنگەی شەوانەڕۆژ کۆمەڵێ خانوو هەبوو؛
کتێبخانە و ژووری پۆلی خوێندن و ساڵۆنی خەوتن.
بۆ نێڵسۆن هەموو شتێك گەورە و بێگانە و نامۆ بوو.
کە لای ڕێگێنت بوو خۆی و جەستیس پێکەوە لە زنجێکدا دەنووستن،
ئێستاکە بۆ یەکەم جار لە خانوودا دەخەوت.
نێڵسۆن تووشی دڵەڕاوکێ بوو.
هەستا پێڵاوە تازەکانی بۆیاغ کرد، ئەگەرچی دەبریسکانەوە.

ڕۆژی دواتر نێڵسۆن پێڵاوەکانی لە پێ کردن و
بە پێپلکەکانی خوێندنگەکەدا زرمەزرم سەر کەوت.
لە دڵی خۆیدا بیری کردەوە:
ـ دەڵێی ئەسپی تازەناڵکراوم دەڕۆم بە ڕێوە.
دەك بە لەعنەت بێ پێڵاوی تازە، چ جیڕەجیڕ و دەنگێکی لێوە دێ.
لەوەیش خراپتر ڕووی دا کاتێ لەسەر زەویی دارینی
پۆلەکە، کە تازە لووس کرابوو، پێی خلیسکا.
کتێبەکانی لە دەستی بەر بوونەوە و
کچێکی جوان چرپاندی بە گوێی کچەکەی هاوڕێیدا، بەڵام ئەوەندە
بەرز قسەی دەکرد کە نێڵسۆن گوێی لێ بوو:
ـ ئەو لاولاوە فێر نەبووە پێڵاو لە پێ بکات.

کچەکان دایانە تریقەی پێکەنین و نێڵسۆنیش تووڕە بوو.
ئاخر ئەم کوڕی سەرخێڵێك بوو،
بەوەیش ڕاهاتبوو کە زیرەك بێت و خەڵك ڕێزی بگرن.
کەچی لێرە "لاولاوێکی گەوج" بوو.

نێڵسۆن حەزی لە وەرزش بوو.
بۆکسێنی دەکرد و مەشقی ڕاکردنی دوورودرێژی دەکرد.
بەڵام زۆر چالاکانە دەرسەکانیشی دەخوێند.
بیرێکی تیژی هەبوو و پلەی باشی وەردەگرت.
لە تەمەنی بیستویەك ساڵاندا لە زانستگە وەرگیرا.
ڕێگێنت دڵی بە کوڕە تازەکەی خۆش بوو



# زانستگەی فۆرت هەیر




خوێندنگەکانی باشووری ئەفریقا ئەو کاتە دابەش کرابوون.
خوێندکارانی سپی لەو خوێندنگەیانە دەیانخوێند کە تەنیا بۆ سپییەکان بوون و
خوێندکارە ڕەشەکانیش دەچوونە خوێندنگەی تایبەتی ڕەشەکان.

لە زانستگەی فۆرت هەیریش هەر وەها بوو،
هەموو هاوپۆلەکانی نێلسۆن ڕەش بوون.

هەموو باشووری ئەفریقا هەر بەو شێوەیە دابەش کرابوو.
لە شەمەنەفەر و لە چێشتخانەکاندا، لە سینەماکاندا، لە ئاودەستخانەکاندا،
دەرگای جیاواز هەبوون.
دەرگایەك بۆ ڕەشەکان،
دەرگایەکیش بۆ سپییەکان.
تەنانەت باخچەکانیش دابەش کرابوون.
لەسەر هەندێ لە تەختەکان تەنیا سپییەکان دەیانتوانی دابنیشن و
لەسەر تەختە خراپەکانیش ڕەشەکان دادەنیشتن.

ئەوانەی لە وڵاتەکەدا بڕیاربەدەست بوون سپییەکان بوون.
بازرگانە هەرە دەوڵەمەندەکان، خاوەنکارەکان، پارێزەرەکان،
دادوەرەکان و سیاسەتمەدارەکان سپی بوون.
سەرۆکوەزیرانیش سپی بوو.




(لە شەمەنەفەر و چێشتخانە و
ئاودەستخانە گشتییەکاندا هێمای
تایبەتی خەڵکانی سپی و ڕەش هەبوون.
بە سپییەکان دەگوترا ئەوروپایی. هەموو
ئەوانی دیکە پێیان دەگوترا نائەوروپایی
یا ناسپی.




وێنەیەکی ساڵی ١٩٧٧

وێنەیەکی ساڵی ١٩٨٠



نێڵسۆن ماندێلا یەکەمین قاتی لە بەر کردووە، ١٩٣٧

لە فۆرت هەیر هەم ئاودەستخانەی ئاو و هەمیش دوش هەبوو.
نێڵسۆن پێشتر شتی وا تازەی هەرگیز بە کار نەبردبوو.
ئەو وا ڕاهاتبوو ددانەکانی بە خۆڵەمێش پاك بکاتەوە و
خۆی بە نەرمەسابوون بشۆرێت.
هەرگیز پێجامەی نەبینیبوو.
ئێستا ئیتر دەستی پێ کردبوو فرچەی ددان و هەویری (شێلراوی) ددان
بە کار بهێنێ و
سابوونێکی بۆنخۆشی کڕی تا خۆی پێ بشوات.
ڕێگێنت قاتێکی تازەی دابوویێ.
نێڵسۆن بەو قاتەوە خۆی وەك ئینگلیزێکی قۆز دەهاتە بەرچاو.

نێڵسۆن زانستگەکەی پێ خۆش بوو.
مامۆستاکانی باش بوون و هاوڕێی تازەی پەیدا کرد.
بوو بە ئەندامی کۆمەڵەیەکی خوێندکاران و زۆرجار هەڵدەبژێردرا ببێتە گوتەبێژی کۆمەڵەکە.

نێڵسۆن بڕیاری دا زۆر بە جیددی بخوێنێت،
دەیویست نمرەی چاکی دەست بکەوێت و بەڵگەنامەی باش وەربگرێت.
دەیویست کارێکی چاکی وە گیر بکەوێت و پارەیەکی زۆر وە دەست بهێنێت.
ئەوسا ڕێگێنت زیاتر شانازیی پێوە دەکرد و
هێندەیش دەستی دەڕۆیشت کە خانوویەکی تازە بۆ دایکی دروست بکات،
خانوویەکی وا کە باخچەی هەبێت و تەخت و کورسیی تازەبابەت و
ئاگردانێکی ڕاستەقینەی تێدا بێت.

ڕۆژێك نێڵسۆن بانگ کرا بۆ لای بەڕێوەبەر.
خۆی و هاوەڵەکانی دژی ئەوە ڕاوەستابوون
کە مافی بڕیاردانیان یەکجار کەم بوو.
داوای ئەوەشیان کردبوو کە لە خوێندنگە
خواردنێکی چاکتریان بدرێتێ.
بەڕێوەبەر نێڵسۆنی ئاگادار کردەوە کە دەبێ واز لەم شتانە بهێنێ، ئەگەرنا
مافی ئەوەی نابێ لە خوێندنی زانستگە بەردەوام بێ.

نێڵسۆن وتی: من ناتوانم واز بهێنم.
ـ ئایا دژڕاوەستان لە خوێندن گرنگترە؟
نێڵسۆن وەرامی دایەوە: ـ داد گرنگترە.

وازی لە پرۆتێستکردن نەهێنا و لەبەر ئەوە دەبوو
واز لە زانستگە بهێنێ، ئەگەرچی ناوەڕاستی وەرزی خوێندن بوو.

کە نێڵسۆن گەڕایەوە بۆ گەورەجێ و هەرچییەك ڕووی دابوو
بۆ ڕیگێنتی گێڕایەوە. ڕێگێنت لە تووڕەییاندا
چاوی پەڕییە تەوقی سەری و قیڕاندی:
ـ تۆ دەبێ گوێڕایەڵی بەڕێوەبەر بیت.
ڕێگێنت گوێی لە ڕوونکردنەوەکانی نێڵسۆن نەگرت.

نێڵسۆن بێدەنگ بوو چۆن دەیتوانی لە ڕووی ڕێگێنتدا ڕاوەستێت
کە لەو ڕۆژەوە هەتیوێکی بچکۆلە بوو، بە خێوی کردبوو؟



## ژنهێنان

ڕێگێنت بڕیاری دا کە دەبێ نێڵسۆن بۆ پاییز
بگەڕێتەوە بۆ زانستگە.
هاوینەکەی دەبوو یارمەتیی ڕێگێنت بدات بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی.

جەستیسیش گەڕایەوە بۆ گەورەجێ.
هەردوو هاوڕێ وەك جاری جاران دەستیان کردەوە بە قسە و گاڵتەکانی خۆیان.
ئێواران لە کێڵگەدا ئاگریان دەکردەوە و
گەنمەشامییان دەبرژاند و
شەوانیش لەژێر ئاسمانی ساماڵدا
لەگەڵ کچەکاندا هەڵدەپەڕین.

چەند حەفتەیەك بوو هاتبوونەوە بۆ ماڵ،
کە ڕێگێنت ویستی قسەیان لەگەڵ بکات.
دەیویست شتێکی گرنگیان پێ بڵێ.
ڕێگێنت بە سیمایەکی جیددییەوە پێی گوتن:
– ڕۆڵەکانم! من وا هەست دەکەم بەم زووانە دەمرم.
بەڵام پێش ئەوەی مردن بمبات بۆ خاکی باووباپیران، بە ئەرکی خۆمی دەزانم ژن بۆ کوڕەکانم بهێنم.

ئەمەی گوت و بە ڕوویەکی پڕ شکۆوە تەماشای کوڕەکانی کرد.
ئەمجا گوتی: ژنم بۆ هەردووتان ڕێك خستووە.

جەستیس و نێڵسۆن بە ترسەوە، بە لاچاو تەماشای یەکتریان کرد: ژنهێنان!
حەزیان نەدەکرد ژن بهێنن!
ڕێگێنت گوتی:
– ئەو دوو کچە زۆر بە وردی هەڵبژێردراون. کچی بنەماڵە و خێزانی زۆر چاکن.
بۆی گێڕانەوە کە جەستیس دەبێ کچی سەرخێڵێك بخوازێت و
نێڵسۆنیش کچەکەی قەشەی گوند بهێنێت.
هەموو شتێك پێشەکی ڕێك خراوە و بڕیار دراوە.

لە کۆتاییشدا وتی:
– هەردوو زەماوەندیش بەم زووانە دەکرێن.

نێڵسۆن و جەستیس سەریان دانەواند و لە کۆبوونەوەکە هاتنە دەرێ.
هەردووکیان وەك یەك نیگەران بوون.
دەیانزانی کە باوك مافی ئەوەی هەیە بڕیار بدات کوڕەکانی کێ بهێنن.
نەریتی گەلی خۆسا وەها بوو.

بەڵام نێڵسۆن و جەستیس بڕیاریان دا چیی تر گوێڕایەڵ نەبن.
ئەوان لە دەرەوەی دێیەکەی خۆیان ژیابوون، خوێندبوویان و
دوو لاوی تازەباو بوون.
نێڵسۆن تا ئەو کاتە چەند جارێك دڵی لە کچان چووبوو.
ئەو گەنجێکی ڕۆمانتیك بوو،
دەیویست کەسێك بهێنێ کە خۆی حەزی لێ کردبێت!
کچی قەشەی گوند ئەو ژنە نەبوو ئەو خەونی پێوە ببینێ.
بێجگە لەوەیش کچە حەزی لە کەسێکی دیکە بوو،
حەزی لە جەستیس کردبوو!



"بەرەو جۆهاننەسبورگ، ١٩٤١

## هەڵاتن

کوڕەکان تێگەیشتن کە قسەکردن لەگەڵ ڕێگێنت
سوودێکی نییە،
چونکە ئەو بڕیاری خۆی دابوو، ڕۆژی زەماوندیش نزیك دەبووەوە.
نەدەکرا ئەمە بگۆڕن.

ئەوجا نێڵسۆن و جەستیس بڕیاریان دا هەڵبێن.
بیریان لەوە کردەوە لە جۆهاننەسبورگ
کە شارێکی گەورە بوو، کانی زێڕیشی لێ بوو،
خۆیان بشێرنەوە.
نەخشەی خۆیانیان بە نهێنی هێشتەوە و هەموو ڕێگە و جێگەیەکیان
بە دزییەوە دانا.
دەبوو تەنیا یەك جانتا لەگەڵ خۆیاندا ببەن.
شمەکی خۆیان ئامادە کرد و چاوەڕوانی ڕۆژ و سەعاتی لەبار بوون، بۆی دەرچن.





بەیانییەکی دووشەممە ڕێگێنت چووبوو بۆ کۆبوونەوەیەك
نێڵسۆن و جەستیس بە خۆیان و جانتایانەوە ئامادە بوون.
ڕێك لەو کاتەدا کە دەیانویست خۆ بدزنەوە ڕێگێنت گەڕایەوە.
بەناو ماڵەکەدا گەڕا و بە گومانەوە پرسیاری کرد:
– کوان، کوڕەکان لە کوێن؟

نێڵسۆن و جەستیس بە دزییەوە چوونە دەرێ و
لەناو لقە بەرزەکانی گەنمەشامییەکاندا، لە بێستانەکەدا خۆیان شاردەوە.
ئەمجا بەسەر گردەکاندا بە پرتاو بۆی دەرچوون.

کوڕەکان وایان دانابوو بە شەمەندەفەر بچن بۆ جۆهانەسبورگ،
بەڵام دەبوو پێشتر پارەیەك پەیدا بکەن بۆ کڕینی بلیێت.
خێرا خۆیان گەیاندە دووکانەکەی دێیەکەیان و پرسیاریان
لە خاوەندووکانەکە کرد، وتیان دەتەوێ دووان
لە حەیوانە چاکەکانی ڕێگێنت بکڕیت؟
دوو گای گەورە و چاك؟

خاوەندووکانەکە ئەمەی بە مامەڵەیەکی چاك زانی.
پارەیەکی باشی دا بۆ کڕینی گایەکان و
نێڵسۆن و جەستیس لەپڕ دەوڵەمەند بوون.
بە سواریی تاکسی چوون بۆ وەستگەی شەمەنەفەر.
نەخشەکەیان ڕێکوپێك جێبەجێ کرا!
بەڵام کاتێ ویستیان بلیێتەکان بکڕن،
کابرای بلیێتفرۆش پێی نەفرۆشتن.

– باوکتان لێرە بوو، زۆر تووڕە بوو، دەیگوت
ئێوە بەتەمان ڕا بکەن.

نێڵسۆن و جەستیس زەندەقیان چوو.
بە پەلە خۆیان گەیاندەوە تاکسییەکە و بانگی
شۆفێرەکەیان کرد، وتیان بمانگەیێنە وەستگەکەی دواتر،
لەوێ کەس کوڕەکانی نەدەناسییەوە.
هەر خێرا بلیێتیان کڕی و چوونە ناو شەمەنەفەرەکەوە،
بەڵام هێشتا کێشەیەکی گەورەیان مابوو؛
کاغەزی سەفەرکردنیان ڕێك نەخستبوو.

# پاسپۆرت لە وڵاتی خۆتدا

هەموو پیاوانی ڕەشی ئەفریقایی ئەگەر بیانویستایە بۆ جێیەك بچن
دەبوو كاغەزێكیان هەبێ،
كە پێی دەگوترا "پاسپۆرتی خۆجێ".
بێ پاسپۆرت دەكرا بگیرێن و بخرێنە زیندانەوە.
بەڵام هەر تەنیا "پاسپۆرتی خۆجێ" بەشی نەدەكرد.
ئەگەر ڕەشێكی ئەفریقایی بچووایە بۆ كاركردن،
دەبوو "بەڵگەنامەی سەفەر"یشی هەبووایە.
ئەمە بەڵگەیەكی نووسراو بوو، دەبوو هەم ئیمزای
پێوە بووایە و هەم مۆر.
لەبەر ئەوەی نێڵسۆن و جەستیس هەڵاتبوون،
بەڵگەنامەی سەفەریان نەبوو.
ئەمە زۆر خەتەرناك بوو،
لەوانە بوو هەر ئان و ساتێك بخرێنە زیندانەوە.

كە شەمەنەفەر ڕاوەستا دابەزین و داوەرێكیان دۆزییەوە،
ئەویش بەڵێنی پێ دان كە بەڵگەنامەی سەفەریان بۆ دەربكات.
نێڵسۆن و جەستیس خۆیان بە یاخی دەزانی،
نەخشەكەیان خەریك بوو سەری دەگرت!
بەڵام داوەرەكە پێش ئەوەی بەڵگەنامەی سەفەریان بداتێ
ویستی تەلەفۆن بۆ سەرۆكداوەری ناوچەكەی ڕێگێنت بكات.
دەیویست بە نەزاكەت بێت و بۆی بگێڕێتەوە كە دوو گەنجی ڕووخۆش
هاتوونەتە سەردانی.
نێڵسۆن و جەستیس بە نیگەرانییەوە تەماشای یەكدییان كرد.
باشە، ئەگەر ڕێگێنت پێی زانی كە ئەمانە خەریكی چین، ئەودەم
چی ڕوو دەدات؟.
داوەر تەلەفۆنی كرد. ئای لەو بەختە چاكە!
كە ئەم تەلەفۆنەكەی كرد، ڕێگێنت ڕێك لەو كاتەدا هاتبووە
سەردانی سەرۆكداوەر.
بەڵام بۆ نێڵسۆن و جەستیس ئەمە بەدبەختی بوو.
دەیانویست وەك دوو منداڵی بچووك
خۆیان لە پشت مێزەكەوە بشێرنەوە.



"وێنەیەكی ساڵی ١٩٧٧



پاسپۆرت لە وڵاتی خۆتدا

ڕێگێنت کە بیستی کوڕەکانی لای داوەرێکی دیکە
دانیشتوون و درۆ دەکەن، دەهری بوو.
قیڕاندی:
– ئەو کوڕانە بگرە! یەکسەر بیانگرە و بۆ ماڵیان بنێرەوە!
داوەریش کەللەیی بوو. ئەویش قیڕاندی:
– کوڕینە، ئێوە دز و درۆزنن. ئێوە منتان خەڵەتان و
ئێستا دەبێ بتانگرم!

نێڵسۆن لە پڕ هەستی بە ئارامییەك کرد.
ئەو لە خوێندنی زانستگەکەی یەك دنیا شت
لەبارەی قانوونەوە فێر بووبوو. بە داوەری وت:
– ڕاستە ئێمە درۆمان لەگەڵ کردوویت، بەڵام ئێمە
هیچ تاوانێکی وامان نەکردووە کە جەنابتان بتوانن
بمانخەنە زیندانەوە.
داوەرتێگەیشت کە نێڵسۆن ڕاست دەکات.
ڕێگەی پێ دان بڕۆن.



نێڵسۆن ماندێلا ٢٢ ساڵان بوو کە گەیشتە جۆهاننەسبورگ

## جۆهاننەسبورگ

کوڕە هەڵاتووەکان تێگەیشتن
کە دەبێ نەخشەی ڕاکردنەکەیان بگۆڕن.
نەیانوێرا بە شەمەندەفەر بڕۆن،
چونکە لەوانە بوو هەمدیس ئاشکرا بن.

بەیانییەک دوای ئەوە توانییان شۆفێرێک بدۆزنەوە و
کابرا ڕازی بوو بە ماشێن ڕێک بیانگەیێنێتە جۆهاننەسبورگ،

هەر ئەو ئێوارەیە گەیشتنە شاری گەورە،
ئاخری نەخشەکەیان سەری گرت.
چرای شەقامەکان و خانووەکان و ماشێنەکانی
جۆهاننەسبورگ لە بەرچاویان دەبریسکانەوە.
نێڵسۆن و جەستیس بە سەرسوورمانەوە تەماشای
دەوروپشتی خۆیان دەکرد.
جۆهاننەسبورگ لەوەی ئەوان بیریان لێ کردبووەوە گەورەتر و جوانتر بوو.
هەموو شارەکە چراخان بوو،
دیار بوو کارەبا لە هەموو شوێنێك هەبوو.
خانووەکان هێندە بەرز بوون کە سەربانەکان نەدەبینران.
لە جامی ماشێنەکەوە دەیانبینی ئۆتۆمۆبیلی بریقەدار و لوکس،
ژنانی ئێسکسووك، پیاوانی قۆزی قاتلەبەر و
شەپقەلەسەر دەهاتن و دەچوون.
ئێستا ئەوان لە شاری کانەزێڕەکان بوون،
بەڵام ئەمان خۆیان هەژار و بنێس بوون.
هەر پارەیەکیشیان مابوو دایانە کرێی سەفەرەکە.





بەشی خوارەوەی کانەکە

# کان

نێڵسۆن و جەستیس بڕیاریان دا لە گەورەترین کانەزێڕدا،
لە کانی (کراونماینز) بۆ کار بگەڕێن.
چوون سەرکاری کانێکیان دۆزییەوە و هەر یەکسەر کاریشیان دەست کەوت.
هیچ باسی ئەوەیان نەکرد کە هەڵهاتوون.

جەستیس لە نووسینگەدا کاری وەرگرت و
نێڵسۆنیش دەبوو ببێتە پۆلیسی کان.
وەك مووچە دەبوو خواردن و نشیمەن و تۆزێ پارەیان بدەنێ.
نێڵسۆن هەر ئەو شەوە دەستی بە کار کرد.
دەستێ جل و جووتێ پێڵاوی قایم و کڵاوئاسنێك و چرایەکی دەستی و
فیقنە (شاور)ێك و کوتەکێکی وەرگرت.

کوتەکەکە دارێکی درێژ بوو، سەرێکی دارینی خڕی پێوە بوو،
بۆ ئەوەی ئەگەر پێویست بوو، شەڕی پێ بکات.
نێڵسۆن بیری کەوتەوە چۆن هاوەڵەکانی لە زنجی خەتەنەکردنەکە
خەونیان بەوەوە دەبینی ببنە کارگەری کان.

ئێستا بە چاوی خۆی دەیبینی ژیانی ناو کان چۆن بوو.
بەمە زارەترەك بوو.

کارکردن لە ژێرزەویدا قورس و خەتەرناك بوو.
ڕێڕەوەکانی کانەکە شێدار و تاریك بوون و کارگەرانی کان وەك کۆیلە تەماشا دەکران.

ئەگەر گوێڕایەڵ نەبوونایە لە کار دەردەکران.
ڕێگەیان پێ نەدەدان ژن و منداڵی خۆیان لەگەڵ بێت.
لەباتیی ئەوە هەموو پیاوەکان پێکەوە لە خانووی دارینی گەورە و ناشیریندا دەژیان.
تەنانەت تەختی ڕاستەقینەی نووستنیشیان نەبوو،
لەسەر تەختی بەردین دەخەوتن.

نێڵسۆن پێی وا بوو کارکردن وەك پۆلیسی کان کارێکی ئاسانە،
جەستسیش کارەکەی خۆی بە دڵ بوو.
بە خۆهەڵکێشانەوە بە یەکتریان دەگوت:
– ئێمە چەند زیرەکین!
دەستیان پێ کرد لای کارگەرانی کانەکە فشە بکەن
کە چۆن لە ماڵ ڕایان کردووە و ڕێگێنتیان خەڵەتاندووە.

ڕۆژێك بانگ کران بۆ نووسینگەی سەرکاری کانەکە.
کابرا ئەو دەنگۆیەی بەرگوێ کەوتبوو،
دەیویست بزانێ ئەو دوو برایە بۆچی هاتوون بۆ جۆهاننەسبورگ.
نێڵسۆن و جەستیس وەك جاران هەر لەسەر درۆکردن بەردەوام بوون.
ئەوجا سەرکار لە کێشووی مێزەکەی تەلەگرافێکی دەرهێنا.
سەرکار تەلەگرافەکەی پێشان دا و بە تووڕەیی وتی:
– پەیامێکم لە باوکتانەوە بۆ هاتووە.
تەلەگرافەکە یەك دێڕی تێدا نووسرابوو:
– یەکسەر کوڕەکان بنێرەوە بۆ ماڵ!



سەرکار قیڕاندی: ئێوە درۆتان لەگەڵ کردووم.
دەستبەجێ لە کارەکە دەریکردن و هەڕەشەی لێ کردن کە
دەیاننێرێتەوە بۆ ماڵی خۆیان.
نێڵسۆن و جەستیس شەرمیان بە خۆیان هات،
بەڵام ڕازی نەبوون بچنەوە بۆ ماڵ.
جل و جانتای خۆیانیان پێچایەوە و بە دزییەوە
لە ناوچەی کانەکە چوونە دەرەوە.

# نووسینگەی پارێزەر

نێڵسۆن و جەستیس سەرلەنوێ هەم بێکار بوون و هەم بێماڵ.
لە ناخی دڵی خۆیدا نێڵسۆن ماندێلا خەونی بەوەوە دەبینی کە
ببێتە پارێزەر، بەڵام نەیدەتوانی بچێتەوە بۆ زانستگەکەی خۆی و
نەشیدەویست بچێتەوە بۆ ماڵ.

ئاوا بیری لێ کردەوە:
– ئەگەر لە نووسینگەیەکدا لە جۆهاننەسبورگ کارێکم دەست بکەوێت،
دەتوانم بە ڕۆژ کار بکەم و ئێوارانیش بخوێنم.
بە کۆمەکی هاوڕێیان ئاخری
لە نووسینگەی پارێزەرێکدا کاری دەست کەوت.
هەروەهایش توانیی ژوورێکی بچووك بە کرێ بگرێت و تێیدا بژی.

ژوورەکەی نە کارەبای هەبوو، نە ئاو،
زەوییەکەی خۆڵ بوو، سەربانەکەیش لە تەنەکە دروست کرابوو،
بەڵام نێڵسۆن دڵی پێ خۆش بوو،
چونکە دەیتوانی لە جۆهاننەسبورگ بمێنێتەوە.





نێڵسۆن ماندێلا دڵی بە کاری نووسینگەکە خۆش بوو.
یەکێ لە خاوەنەکانی نووسینگە ناوی ئاغای سیدێلسکی بوو.
دەستێ جلی خۆی دا بە نێڵسۆن بۆ ئەوەی
کاتێ لەسەر کارە قۆز و پۆشتە و پەرداخت دیار بێت.

ئاغای سیدێلسکی پیاوێکی پشوودرێژ و بەخشندە بوو،
پارەی دەدا بە خوێندنگەکان بیدەنە منداڵانی هەژار.
سیدێلسکی وتی:
– خوێندن، ماندێلا، خوێندن! تەنیا خوێندنە کە دەتوانێ گەلێك ڕزگار بکات!
کەسێك خوێندبێتی ناکرێ بچەوسێنرێتەوە، چونکە خۆی دەتوانێ بیر بکاتەوە.

بەڵام ئاغای سیدێلسکی پێی وا بوو سیاسەت خەتەرناکە و
هەمیشە وریای دەکردەوە: لە سیاسەت دوور بکەوەرەوە!
لە نووسینگەی پارێزەرەکە، نێڵسۆن بۆ یەکەمین جار
هاوڕێیەکی سپیی پەیدا کرد، گەنجێك بوو، ئەویش
لەوێ کاری دەکرد، ناوی نات بوو.
ڕۆژێکیان کاتی فراوین بوو، نات یەکێك لە بابۆڵەکانی خۆی
بۆ نێڵسۆن درێژ کرد و هانی دا کە بیگرێت.
نێڵسۆن برسیی بوو، بۆیە بە قسەی ناتی کرد و
بابۆڵەکە بوو بە دوو لەتەوە. نات وتی:
– دەی، بیخۆ!
لە کاتێکدا هەر یەکێکیان لەتە بابۆڵەی خۆی دەخوارد، نات گوتی:
– نێڵسۆن، ئەوەی ئێستا ئێمە کردمان بیروباوەڕی کۆمونیزمە.
دەبێ مرۆڤ هەموو شتێك وەك یەك دابەش بکات.

نات بۆی گێڕایەوە کە لەگەڵ پارتیی کۆمونیستدایە و
دەیویست کۆمەڵگە بە جۆرێك بگۆڕێت کە داد جێگیر ببێت.
دەوڵەمەندەکان دەبێ دەستەڵات و پارە لەگەڵ هەژاراندا
دابەش بکەن. نات وای بیر دەکردەوە.
نێڵسۆن گوێی گرت بێ ئەوە قسەکەی پێ ببڕێ.
نات پرسیاری لێ کرد: دەتەوێ ببیتە ئەندامی پارتییەکەمان؟
نێڵسۆن بیری لە وریاکردنەوەکەی ئاغای سیدێلسکی کردەوە
کە سیاسەت چەندە خەتەرناکە.
دوودڵ بوو. ئەو لە کڵێسای مێتۆدیست
مامۆستای یەکشەممان بوو، ئەوەی پێ خۆش نەبوو
کە کۆمونیستەکان دەیانگوت دین بۆ گەل وەك تلیاك وایە.

نێڵسۆن ناتی خۆش دەویست و بابۆڵەکەیشی بە دڵ بوو،
بەڵام نەیدەویست ببێتە ئەندامی هیچ پارتییەك.

# ئەلیکساندرا

ئەو ژوورەی کە نێڵسۆن بە کرێی گرتبوو
بەڕاستی کوڵبەیەکی تەنەکەیین بوو، لە پشتەوەی ماڵێك لە گەڕەکی ئەلیکساندرا.
بە دەوری جۆهاننەسبورگدا شاری تەواو دروست دەبوون کە
لەم جۆرە کوڵبە و خانۆچکانە پێك هاتبوون و لەوێ
کارگەرانی ڕەش، کە لەو شارە گەورەیەدا عەودالّی بەختیاری بوون، دەژیان.

هەندێکیان کاریان دەدۆزییەوە و دەبوونە کارگەری کان،
جلشۆر، باخچەوان یا گسکدەر.
هەندێکی دیکەیشیان ماشێنی پیاوانی سپییان دەشۆرد و
چاودێریی منداڵەکانیان دەکردن.
بەڵام زۆریش هەبوون کە نە کاریان دەدۆزییەوە و نە بەختیاری، بەناو شەقامەکاندا دەسووڕانەوە.
هەندێ جار سەرخۆش دەبوون، هەندێ جار شەڕیان دەکرد و دزییان دەکرد.
بەتایبەت شەوان خەتەرناك بوو لە ماڵ بچیتە دەرێ، چونکە
ئەو کاتانە تاقمی چەتە حوکمیان دەگرتە دەست و
بە دەمانچە و چەقۆ دوگمەدارەکانیانەوە
بە هەموو لایەکدا خەڵکیان دەدایە بەر و
لەسەر پارەیەکی کەم پیاویان دەکوشت.

ئەلیکساندرا هەم دۆزەخ بوو، هەمیش بەهەشت.
نێڵسۆن ئەوەی پێ خۆش بوو کە خەڵکەکەی تێکەڵاو بوون.
پێشتر ئەو تەنیا لەناو خەڵکانی گەلەکەی خۆیدا،
لەناو گەلی خۆسادا، ژیابوو.
لە ئەلیکساندرا هاوڕێکانی نێڵسۆن خەڵکی هەموو وڵاتەکە بوون و
بە زمانی جۆراوجۆر قسەیان دەکرد.
نێڵسۆن بیری دەکردەوە.
– ئێمەی خەڵکی ئەفریقای باشوور گەلانی جیاواز نیین
کە بە زمانی جیاواز قسە دەکەین، ئێمە یەك گەلین کە
بە زۆر زمانی جیاواز دەدوێین.



شارۆچکەی ئەلیکساندرا لە ١٩٥٠کاندا

لە ئەلیکساندرا نێڵسۆن یەکێك بوو لەناو هەژارانی دیکەدا.
ئەو تاکە قاتەی هەیبوو ئەوەندە چاك کرابووەوە،
کە ئیتر پینەکان قاتەکەیان داپۆشیبوو.
نێڵسۆن ئەگەر جلی بکڕییایە پارەی بۆ خواردن نەدەمایەوە.
ئەگەر بە سواریی پاس بچووایەتە سەر کار، پارەی نەدەما
مۆم بکڕێت.
زۆربەی جاران دە کیلۆمەتر بە پێیان دەچوو بۆ سەر کار و
دە کیلۆمەتریش ڕێگەی گەڕانەوە بوو بۆ ماڵ.
پێویستی بە مۆم بوو، ئەگەرنا
نەیدەتوانی بە ئێواران بخوێنێ.

ئەلیکساندرا ناو نرابوو "تاریکەشار"، چونکە
کارەبای نەبوو،
زۆریش خەتەرناك بوو دوای خۆرئاوابوون بچیتە ناو شەقامەکان.
نێڵسۆن بیری هێمنی و ئاسمانی ساماڵی
دێیەکەی سالآنی منداڵیی خۆی دەکرد.



لە ئەلیکساندرا تاریکایی خەتەرناك بوو، شەویش
پڕ بوو لە دەنگەدەنگ.
جاروبار یەکێك پێدەکەنی، جاروباریش
کەسێك دەکوژرا.

نێڵسۆن ماوەیەك بوو لە شار دەژیا، ڕۆژێ پەیامێکی
پێ گەیشت کە ڕێگێنت دەیەوێ چاوی پێ بکەوێت.
لەوێوە هاتبوو بۆ جۆهاننەسبورگ بۆ ئەوەی
لەگەڵ کوڕەکانیدا قسە بکات.

نێڵسۆن کەللەیی بوو. ڕێگێنت چیی دەویست؟
دەیویست ڕازیی بکات بگەڕێتەوە بۆ ماڵ؟
دەیویست شەڕی لەگەڵ بکات؟

بەڵام ڕێگێنت یەك قسەی تاڵ و ڕەقیشی پێ نەگوت،
نە لەبارەی هەڵاتنەوە، نە لەبارەی گایە فرۆشراوەکانەوە و
نە لەبارەی زەماوەندی هەڵوەشێنراوەوە.
لەجێی ئەوە پرسیاری خوێندنەکەی و
پرسیاری کارەکەی لە نووسینگەی پارێزەرەکە
لە نێڵسۆن کرد.
ڕێگێنت دوای ئەو سەردانە زۆری پێ نەچوو، مرد.

نێڵسۆن و جەستیس هەواڵی مردنەکەیان لە ڕۆژنامەدا خوێندەوە.
هەردوویان تۆقین و بە پەلە چوونەوە بۆ ماڵ.
بەڵام پێش ئەوەی ئەوان بگەنە جێ، ئەو نێژرابوو.
نێڵسۆن هەستی بە شەرمەزاری دەکرد.
ئێستا ئیدی نەیدەتوانی داوای لێبووردن بکات.
ئەو بەرانبەر یەکێك لەو کەسانەی کە لە هەمووان
زیاتر کۆمەکی کردبوو، هەم درۆی کردبوو،
هەمیش برینداری کردبوو.



## سیاسەت

ئاغای سیدێلسکی لە نووسینگەی پارێزەر بەردەوام
هەر نێڵسۆنی وریا دەکردەوە توخنی سیاسەت نەکەوێ، پێی دەگوت:
– ئەگەر چاوت بە کەسانێك بکەوێت کە خەریکی سیاسەتن،
لەگەڵ دەستەڵاتدا تووشی کێشە دەبیت.
بیرت ژەهراوی دەبێ!
کارەکەت خراپ دەبێت،
هەرچی پارەت هەیە دەیدۆڕێنی، خیزانەکەت پارچەپارچە دەکەیت،
خۆیشت دەکەویتە زیندانەوە!

نێڵسۆن گوێی لێ گرت و تووشی دڵەڕاوکێ بوو.
کۆمەڵێ برادەری هەبوون کە خەریکی سیاسەت بوون.
ئەو دۆستانە هەرگیز
ئەوەندەی نێڵسۆنیان نەخوێندبوو.
لەگەڵ ئەوەیشدا، چ لەبارەی کۆمەڵگەوە و چ لەبارەی جیهانەوە
لەو زیاتریان دەزانی.

نێڵسۆن دەستی پێ کرد بچێ بۆ کۆبوونەوەی سیاسی و
کتێبی وای بۆ خوێندنەوە وەردەگرت
کە لە خوێندنگە جوانەکانی دەست نەکەوتبوون.
دۆستان دەیانگوت:
– چاکترین سیاسەت سیاسەتی (ئەی. ئێن. سی: ANC)یە.
ئەی. ئێن. سی، واتە کۆنگرەی نیشتمانیی ئەفریقا.
نێڵسۆن پێیشی وا بوو کۆبوونەوەکانی ANC دڵکێشن.
لەوێ سیاسەت هەرگیز درێژدادڕی و بێزارکەر نەبوو،
هەر کەسێك چیی بویستایە قسەی لێوە دەکرد.
گوتوبێژیان لەسەر ڕەگەزپەرستی، خانووی خراپ،
کرێخانوو و بلیێتی گرانی پاسەکان دەکرد.
لە دژی ئەوەی کە قانوون بۆ سپییەکان و ڕەشەکان
جیاواز بوو پرۆتێستیان دەکرد.
دۆستان دەیانگوت: ANC بە تەواوی دژی ڕەگەزپەرستییە.
لە داهاتوودا دەبێ هەموو خەڵکی باشووری ئەفریقا
مافی وەکیەکیان هەبێت.



نێڵسۆن لە کۆبوونەوەکاندا هیچی نەدەگوت.
لەباتیی ئەوە چاک گوێی دەگرت و
سەرنجی دەدا چۆن ئاخێوەرانی جیاواز
قسەی خۆیا دەکەن.
ئەوەی بیر دەکەوتەوە چۆن سەرخێڵ جۆیی و ڕێگێنت
لە گوندەکەی سالانی منداڵیدا لە کۆبوونەوەکاندا قسەیان دەکرد.

ڕۆژێك نێڵسۆن کەوتە دوای هاوەڵەکانی و چوو بۆ خۆپێشاندان.
دەستگاکانی پاسەکان نرخی بلیێتیان گرانتر کردبوو و
دەهەزار کەس خۆیان پێشان دەدا.
داوایان دەکرد نرخی بلیێت کەم بکرێتەوە
ئەگەرنا سواری پاس نابن.

هەزاران کارگەر دەستیان پێ کرد بە پێیان
بچنە سەر کار و بگەڕێنەوە.
پاسەکان چۆڵوهۆڵ بە لایاندا تێدەپەڕین و
دەستگاکانی پاس هیچ پارەیەکیان دەست نەدەکەوت.
دوای نۆ ڕۆژ خاوەنی دەستگاکانی پاس
کۆڵی دا و نرخی بلیێت کەم کرایەوە.

کۆبوونەوەیەکی سیاسی لە دەرەوەی کارگەیەك





کۆبوونەوەیەکی پرۆتێست دژی قانوونە ناڕەواکان

ئەمە کارێکی زۆری کردە سەر نێڵسۆن
زۆری پێ خۆش بوو کە لەگەڵ ڕەوتی گەلەکەیدا بڕوات.

ئێستا ئەوەی بینی کە پرۆتێست سوودی هەیە.
بووبووە دڵکێشراوی سیاسەت.

# زانستگەی ویتس

نێلسۆن ئێواران دادەنیشت و لە بەر ڕووناکیی مۆمێکدا دەیخوێند،
بەڵکە بگاتە ئامانجی خۆی: بخوێنێ تا دەبێتە پارێزەر!
ئەو خاوەنبڕیار بوو، لە هەموو ئەزموونەکانیدا سەر کەوت.
هەر زوو توانیی لە زانستگەی ناوداری ویتس
لە جۆهاننەسبورگ دەست بە خوێندن بکات.

لەم زانستگەیەدا نێلسۆن بۆ یەکەمین جار لە ژیانی خۆیدا
لەگەڵ لاوانی سپیی هاوتەمەنی خۆیدا دەیخوێند.
هەستی بە شەرمنی و تەنیایی دەکرد.
هەموو ئەوانی دیکەی قانوونیان دەخوێند سپی بوون.
ئەگەر چاوی بە ڕەشێکی تری ئەفریقایی بکەوتایە
زۆرتر لە ڕێڕەوەکەدا دەیبینی،
ئەویش خزمەتکارێك بوو فەرمانێکی بە جێ دەهێنا،
چای دەبرد یا ئاودەستی پاك دەکردەوە.

ڕۆژێکیان نێلسۆن چەند دەقیقەیەك درەنگ گەیشتە دەرسێك.
چوو لەسەر جێگەیەکی چۆڵ بە تەنیشت یەکێك
لە هاوپۆلەکانیەوە دانیشت. هاوپۆلەکەی
یەکسەر کتێبەکانی خۆی کۆ کردەوە و چوو لەولاوە،
لە جێگەیەکی تر، لەوەوە دوور، دانیشت.
نێلسۆن دڵگران بوو، هەستی کرد سووکایەتیی پێ کراوە.
بەڵام هەر لە ویتس گەلێ خوێندکاری سپی و هیندیی بینی و
بوون بە هاورێی نزیکی.
ئەوەی بۆ دەرکەوت کە خەڵکانێکی گەنج هەن،
لە هەموو ڕەگەزێك، کە خەباتیان بۆ ئازادی دەکرد.



# ئێڤلین

یەکێك لە دۆستە هەرە چاکەکانی نێڵسۆن ناوی والتەر سیسولو بوو.
ماڵەکەی هەمیشە پڕ بوو لە خەڵکێك کە خەریکی باسوخواسی سیاسەت بوون.
دایکی میهرەبانی والتەر خواردنی دەدانێ و نێڵسۆن زۆری پێ خۆش بوو.
ئەگەر لەوێ نەبووایە خواردنی گەرمی نەدەخوارد، چونکە
لە ماڵە تەنەکەکەی خۆیدا ئاگردانێك نەبوو.

لە ماڵەکەی والتەردا کچێکی گەنج دەژیا ناوی ئێڤلین بوو.
کچە سێوی و بێباوك بوو، لە خوێندنگەی نەخۆشەوانی دەیخوێند.

ماڵی والتەر وەك کچی خۆشەویستی خۆیان تەماشای ئێڤلینیان دەکرد.
ئێڤلین کچێکی جوان و کەمدوو بوو.
میهرەبان بوو، خۆهەڵکێشیش نەبوو.
نێڵسۆن دڵی لێ چوو!

هەمووی چەند مانگێك بوو ئێڤلینی ناسیبوو،
داوای کرد شووی پێ بکات، ئەویش وتی باشە.
ئەویش هەر لە یەکەم نیگاوە دڵی لە نێڵسۆن چووبوو.

ئێڤلین و نێڵسۆن دەستیان نەدەڕۆیشت
زەماوەندێکی ڕۆمانتیك ڕێك بخەن.
تەنانەت پارەی ئەوەیشیان نەبوو ئاهەنگێکی زەماوەن ڕێك بخەن.
ئەوەندەیش دەستیان نەدەڕۆیشت ماڵێکی خۆیان هەبێت،
لەبەر ئەوە، لای خزمەکانی ئێڤلین ژیان،
بەڵام یەکتریان زۆر خۆش دەویست و
هەر زوو یەکەم منداڵیان لە دایك بوو.



نێڵسۆن ماندێلا و ئێڤلین نتۆکۆ ماسێ بوون
بە ژنومێرد، ١٩٤٤

هەر نزیکەی ئەو کاتانە بوو کە نێڵسۆن و والتەر و هەندێ گەنجی دیکە
یەکێتییەکی لاوانیان بۆ ANC دامەزراندبوو.
نێڵسۆن هێشتا لە نووسینگەی پارێزەرەکە کاری دەکرد و
هاوکاتیش قانوونی دەخوێند و
سیاسەتیش هەرچی زیاتر کاتی لە ژیانی داگیر دەکرد.
زۆرجار شەوان درەنگ دەگەڕایەوە بۆ ماڵ و
هەندێ جاریش هەموو شەممە و یەکشەممەکە لە ماڵ نەدەبوو.
ئێڤیلین بیری مێردەکەی دەکرد.

یەکەمین منداڵی ئێڤیلین و نێڵسۆن کوڕێك بوو،
ناوی تێمبی بوو.
هەر زوویش منداڵێکی دیکەیان بوو؛ کچێك.

لە سۆوێتۆ، گەڕەکێکی کەنار شاری جۆهانەسبورگ،
خانوویەکیان بە کرێ گرت.
ناونیشانەکەیان ئاوەها بوو: ئۆرلاندۆ وێست، ژمارە: ٨١١٥
خانووەکە بچووك بوو، کەوتبووە سەر شەقامێکی تۆزاوی.

دەوروبەریان سەدان ماڵی بچووکی کۆن و دارین بوو.
هەموو لە یەك دەچوون، دەتگوت پاکەتە شخاتەن.
هەموویان زەوییەکانیان چیمەنتۆ و سەربانەکانیان تەنەکە بوون.
لە پشت هەموو ماڵێکەوە سەتڵێك هەبوو،
ئەمە ئاودەستخانە بوو.

نێڵسۆن شانازیی بە خێزان و ماڵەکەیەوە دەکرد،
ژنەکەی خۆی خۆش دەویست و
حەزی دەکرد لەگەڵ منداڵەکانیدا یاری بکات.
بۆ یەکەمین جار لە ژیانیدا
توانیی هاوڕێکانی بانگهێشتن بکات بۆ ماڵی تایبەتی خۆی.

دیسانیش هەر زیاتر و زیاتر لە ماڵ دوور دەکەوتەوە.
کە کچە بچکۆلەکەیان نەخۆش کەوت و مرد
نەیتوانی دڵی ئێڤیلین بداتەوە.
بە زۆری دەچووە کۆبوونەوە، دەچووە سەفەر و لە خۆپێشاندانەکاندا بەشداریی دەکرد.
سیاسەت بووبوو بە ماڵەکەی تری.

# ئەپارتهاید

ئەگەرچی نێڵسۆن ماندێلا تەمەنی سی ساڵ بوو، کەچی هێشتا مافی دەنگدانی نەبوو.
هیچ ڕەشێکی باشووری ئەفریقا ئەو مافەی نەبوو.

نێڵسۆن خەریك بوو شێت دەبوو.
ڕەشەکان گەورەترین کۆمەڵە خەڵکی باشووری ئەفریقا بوون.
ئەی بۆچی دەبوو مافیان لە مافی سپییەکان کەمتر بێت؟
بۆچی دەبوو لە ناوچەی تایبەتیدا،
کە هەژار بوو و زەوییەکەی خراپ بوو، بژین؟
بۆچی لە خانووی خراپتردا دەژیان، دەچوونە خوێندنگەی خراپتر و
سواری پاسی خراپتر دەبوون؟
بۆچی دەبوو ڕەشەکان لەناو وڵاتەکەی خۆیاندا پاسپۆرتیان هەبێ؟

حوکوومەتی ئەپارتهاید بەزۆر خەڵکی دەگواستەوە





گرۆی ڕەگەزە جیاوازەکان دەبوو بە جیا لە یەکتر بژین

ساڵی ١٩٤٨ پارتیی ناسیۆنالیست لە باشووری ئەفریقا
دەستەڵاتی کەوتە دەست و
بەمە وای لێ هات ڕەشبوون زەحمەتتر بێت.
ناسیۆنالیستەکان خەڵکەکەیان بەپێی ڕەگەز دابەش کرد و
پێیان وا بوو کە ئەم ڕەگەزانە بە هیچ جۆرێك نابێ تێکەڵ بن.
ئەمە ناوی ئەپارتهاید بوو.
پارتیی ناسیۆنالیست دەستی کردە بەکارهێنانی کۆمەڵێ قانوونی سەخت.
ژن و ژنخوازییان لەنێوان ڕەش و سپییەکاندا قەدەغە کرد و
کۆمەڵەخەڵکی جیاوازی باشووری ئەفریقایان ناچار کرد
لە یەکتر جیا بژین.
سپییەکان، هندییەکان، ڕەنگدارەکان و ڕەشەکان
نەدەبوو تەنانەت لە یەك گەڕەکیشدا بژین.

زۆر خێزان ناچار کران واز لە ماڵەکانی خۆیان بهێنن و
بار بکەن بۆ ئەو ناوچانەی
کە تەنیا ڕەگەزەکەی خۆیانی لێ دەژیا.
دایکان خۆیان دەدا بە زەویدا،
باوکان توند دەستیان لە دەرگاکان گیر دەکرد و
منداڵان دەگریان و شەڕیان دەکرد.
هیچی سوودی نەبوو، دەبوو هەموو بار بکەن
بۆ ئەوەی لەو ناوچانەدا بژین کە سەرتاسەر یەکڕەگەزە بوون.
خێزانی وا هەبوون خوشکوبراکان هیچ لە یەك نەدەچوون.
منداڵێك پێستی ڕەش و قژەکەی لوول بوو،
منداڵێکی تر پێستەکەی سپیتر و قژەکەی
ڕاست و خاو بوو.
ئەوسا بە یەکێکیان دەگوترا ″ڕەش″ و بەوی دی ″ڕەنگدار″.
بەڵام منداڵی ڕەش هەبوون، قژیان شەپۆلاسا بوو،
منداڵی ڕوونڕەنگیش هەبوون قژیان لوول بوو.

هەندێ جار بۆ دەستگاکانی دەستەڵات زەحمەت بوو بڕیار بدەن
منداڵێك بە ڕەش دابنرێت یا بە ڕەنگدار.
ئەوسا قەڵەمێکیان دەخستە ناو قژی منداڵەکە.
ئەگەر قەڵەمەکە ڕاوەستابایە دەیانگوت ئەم منداڵە ڕەشە.
قەڵەمەکە بکەوتایەتە خوارەوە
دەیانگوت منداڵەکە سپییە، ڕەنگدارە یا هندییە.



پۆلیس بەخۆیان و سەگەکانیانەوە خەڵکیان ڕاو دەنا



## پرۆتێست و قەدەغەکردن

زۆر لە گەنجان پشووکورت و بێتەحەمول بوون و دەیانویست
توندوتیژی بە کار ببەن
بۆ ئەوەی بێدادی و ناهەقییەکان بگۆڕن،
بەڵام ANC دژی توندوتیژی بوو.

ئەندامانی ANC خەڵکیان هان دەدا:
– دژی قانوونەکان ڕاوەستێن، مان بگرن، پرۆتێست بکەن،
بەڵام توندوتیژی بە کار مەهێنن!

ANC گوێی لە هیندییەکانی دانیشتووی باشووری ئەفریقا گرتبوو.
یەکێك لە سەرکردەکانیان کوڕی مەهاتما گاندیی پاڵەوانی ئازادی بوو.


ڕێپێوانێك، ساڵی ١٩٥٨

هیندییەکان لە ئەفریقای باشوور دەیانویست
بە یارمەتیی شێوەکارەکانی ناتوندوتیژیی گاندی
قانوونەکان بگۆڕن.
ماوەی دوو ساڵان دژی قانوونێك کە پێی دەگوترا
قانوونی گێتۆ، پرۆتێستیان کردبوو.
ئەو قانوونە هندییەکانی باشووری ئەفریقای ناچار دەکرد
لە هەندێ ناوچەی تایبەتی هندیدا بژین و دووکان دابنێن.

هەزاران ژن و پیاوی هندی دژی قانوونەکە ڕاوەستان.
تەنانەت کە خرانە بەندیخانەیشەوە هەر نەترسان.
ئەندامانی یەکێتیی لاوانی ANC سەرسووڕماوی
ئازایەتی و تەحەمولی هندییەکان بوون.

نێڵسۆن ماندێلا لە زۆر کۆبوونەوەی ANC دا قسەی دەکرد.
ئەوەندە سادە و ئاسان قسەی دەکرد هەمووان تێدەگەیشتن.
لەبەر ئەوەیش دەستگاکانی دەستەڵات دەیانویست بێدەنگی بکەن.
ئەوان زیاتر دەیانویست بیخەنە زیندانەوە،
بەڵام نێڵسۆن ماندێلا هیچ شتێکی ناقانوونیی نەکردبوو.
تاکە شێوەیەك بۆ بێدەنگکردنی ئەوە بوو
قەدەغەی تەواوی بخەنە سەر.

کەسێك کە قەدەغەی تەواو دەکرا
نەیدەتوانی بۆ هیچ لایەك سەفەر بکات،
نەیدەتوانی لە هیچ کۆبوونەوەیەکدا بەشدار بێت و
دەیتوانی هەر جارێك تەنیا لەگەڵ یەك کەسدا قسە بکات.

یەکەمین قەدەغەکردنی تەواوی نێڵسۆن
شەش مانگ درێژەی کێشا.
دەبوو لە ماڵدا دابنیشێ
بەڵام بۆی زەحمەت بوو خەریکی کارەکەی بێت.
بۆی نەبوو لە کۆبوونەوە سیاسییەکاندا قسە بکات.
تەنانەت ڕێگەی ئەوەیشیان پێ نەدا لە ئاهەنگی
لەدایکبوونی کوڕەکەیدا ئامادە ببێت.

ماهاتما گاندی لە نووسینگەی خۆیدا لە
ئەفریقای باشوور، ١٩٣١. گاندی
ئەوەیانە کە لای ڕاستەوە دانیشتووە.





نێڵسۆن ماندێلا لەگەڵ دوو سیاسەتکاردا: جەیمس مۆرۆکا و یووسف دادوو.

## سیاسەت و دڵپیسی

نێڵسۆن و ئێڤیلین دوو منداڵی تریشیان بوو
بەڵام ئێستا ئیتر بەختەوەر نەبوون.
ئێڤیلین خەفەتی بۆ کچە بچکۆلە مردووەکەی دەخوارد و
لای گەواهەکانی یەهووڤا بۆ دڵدانەوە و دڵارامی دەگەڕا.
دەیویست بار بکاتەوە بۆ ترانسکەی و
لەگەڵ مێردەکەی و منداڵەکانیدا ژیانێکی هێمن بژی.

نێڵسۆن پیاوێکی قۆز بوو،
ژنان خۆشیان دەویست و ئەویش خۆشی دەویستن.
ئێڤیلین دەنگۆیەکی بەرگوێ کەوت کە نێڵسۆن پێوەندیی
لەگەڵ ژنێکی ئەندامی ANC دا هەیە.
کە نێڵسۆن دوای کۆبوونەوەی درەنگوەختی سیاسی دەگەڕایەوە بۆ ماڵ
دەبوو بۆ ئێڤیلینی ڕوون بکاتەوە
لە کوێ بووە و لەگەڵ کێ قسەی کردووە.



ئێڤیلین پێی وت دەبێ لەنێوان ئەو و ANC دا یەکێکیان هەڵبژێرێت.
قسە و قسەڵۆك لەبارەی ژنەکەی دیکەوە بەردەوام بوو.
ئێڤیلین دەیویست ڕاستییەکە بزانێت و
لەگەڵ نێڵسۆندا زۆرجار دەبوو بە شەڕیان.
نێڵسۆن تەختی نووستنەکەی خۆی گواستەوە بۆ ژووری دانیشتن.
جلە چڵکنەکانی خۆی بۆ شۆردن دەبردە ماڵی ئامۆزایەکی و
نانیشی لەگەڵ دۆستەکانیدا دەخوارد.

یەکێك لە دۆستە هەرە چاکەکانی نێڵسۆن ناوی ئۆلیڤەر تامبۆ بوو.
ئۆلیڤەریش قانوونی خوێندبوو.
ئەو زۆر دیندار بوو و لە ڕاستیدا دەیویست ببێتە قەشە.
نێڵسۆن پێشنیازی کرد کە لەجێی ئەوە پێکەوە
نووسینگەیەکی پارێزەری بکەنەوە. نێڵسۆن وتی:
– ئەودەم بەڕاستی دەتوانین یارمەتیی خەڵکی وڵاتەکەمان بدەین.
هەردوو هاوڕێ جێگەیەکیان لە کەسێکی هندی بە کرێ گرت و
دەستگای پارێزەریی ماندێلا و تامبۆیان کردەوە.
هەر زوو وای لێ هات خەڵکی لە بەر دەرگای نووسینگەکەدا بە ڕیز دەوەستان.
زۆر خەڵکی هەژار پێویستیان بە یارمەتیی ئەوان بوو
دژی دەستگاکانی دەستەڵات.



ماندێلا و تامبۆ یەکەمین نووسینگەی پارێزەرانی
ئەفریقی بوو لە ئەفریقای باشوور

# بەڵگەنامەی ئازادی

نێڵسۆن ماندێلا لەسەر دژڕاوەستانی قانوونەکانی حوکوومەت بەردەوام بوو.
دیسان قەدەغەی تەواوی خرایە سەر و لێی قەدەغە کرا لەگەڵ ANCدا بێت.
پارتیی کۆمونیست قەدەغە کرابوو، هەموو ئەوانەیش دژی دەوڵەت پرۆتێستیان دەکرد لەوە بوو بخرێنە زیندانەوە.

ساڵی ١٩٥٥ لە شاری کلیپتاون کۆنگرەیەك ڕێك خرا و
لە سێهەزار کەس زیاتر تێیدا بەشدار بوون.
لە کۆنگرەکەدا پیرەپیاوی دەموچاو چرچولۆچی گوندی و
ژنانی هندیی ساریپۆش و بازرگانانی ملپێچ لە مل و
داپیرەی ڕەش بە جلی تێرڕەنگی ANCیەوە ئامادە بوون.
هەم قەشەی لێ بوو، هەمیش کۆمونیست.




بەشداربووانی کۆنگرەی گەل لە کلیپتاون، ١٩٥٥



ژنانی هندی لە کۆنگرەکەدا

لەسەر پەیامی ئازادی، بەیاننامەی ئازادی،
کە لەبارەی پاشەڕۆژی باشووری ئەفریقاوە بوو، بڕیاریان دا.
پەیامەکە بەم وشانە دەست پێ دەکات:
"ئێمەی گەلی ئەفریقای باشوور، ڕوونی دەکەینەوە،
تا هەموو وڵاتەکەمان و هەموو دنیا بزانن، کە ئەفریقای باشوور
هیی هەموو ئەوانەیە کە لێرە دەژین؛ ڕەش و سپی."
پەیامی ئازادی داوای دادی دەکرد لەناو کۆمەڵەخەڵکانی
زۆری باشووری ئەفریقادا. نەدەبوو کەس
بە هۆی ڕەگەز، جنس یا دینەوە، بە خراپی
هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکرێ.



# خیانەتی باڵا

بەیانییەکی زووی مانگی کانوونی یەکەم (دێسەمبەر)ی ١٩٥٦
قایم لە دەرگای ماڵی ماندێلا درا.
نێڵسۆن بیری کردەوە: هیچ دۆستێك وەها لە دەرگا نادات.
زوو جلەکانی لە بەر کرد و دەرگاکەی کردەوە.
سێ پۆلیس لە بەر دەرگاکە ڕاوەستابوون.
بەزۆر چوونە ژوورەوە بۆ ناو ئەو خانووە بچکۆلەیە و
دەستیان پێ کرد هەموو کون و قوژبنێ بگەڕێن.
کێشووی مێزەکانیان ڕاکێشا و نامەیان دەخوێندەوە.
سندووق و دۆلابی جلوبەرگیان دەکردەوە، تەماشای ژێر
تەختی خەوتنیان دەکرد.
پاشان نێڵسۆنیان گرت.
منداڵەکان بە ئاگا هاتن و بینییان چۆن باوکیان خرایە
ناو ماشێنی پۆلیسەوە و بردیان.

هەر ئەو ڕۆژە پۆلیس لە هەموو باشووری ئەفریقا دایان بەسەر ماڵاندا.
ماڵ بە ماڵیان دەپشکنی.
ڕێبەرانی ئازادییان بەند کرد و بە سواریی فڕۆکەی خێرای عەسکەری
گەیاندیاننە جۆهاننەسبورگ.
لە ماوەی حەفتەیەکدا ١٥٦ کەس بەند کران،
ئەمانە هەم ژن بوون و هەمیش پیاو.
لەمانە ١٠٥ کەسیان ڕەش بوون، ٢٣ سپی، ٢١ هندی و ٧ ڕەنگدار.
بەوە تاوانبار کرابوون کە ویستوویانە دەوڵەت بڕووخێنن.
تاوانەکەیان پێی دەگوترا خیانەتی باڵا،
سزاکەیشی مردن بوو.
بەندییەکان بران بۆ "قەڵا"
کە زیندانێکی گەورە بوو لە ناوەڕاستی جۆهاننەسبورگدا.
پیاوان برانە دەرەوە بۆ حەوشەیەکی چوارگۆشە.
پاسەوانەکان لەوێ زۆریان لێ کردن کە بە ڕووتی
لەپاڵ دیوارەکاندا ڕابوەستێن.
سەعاتێ زیاتر لە بەر ئەو با و سەرمایە بە دەم لەرزەوە ڕاوەستان.



گیراوەکان لە واگۆنێکی پۆلیسدا بە شێوەی ANC سەڵاو دەکەن

کە جلەکانی خۆیان وەرگرتەوە
پاسەوانەکان هەموویانیان وەك ئاژەڵ دایە پێش
بۆ ناو دوو ژووری گەورە.

هەر یەکێکیان حەسیرێکی وەرگرت لەسەری بخەوێت.
زەوییەکە چیمەنتۆ بوو.
لە سەرماندا ڕەق دەبوونەوە و خواردنێکی خراپیان پێ دەدان.
لە ژوورەکەدا یەك دانە کورسی یا تەخت نەبوو.
توالێتەکەیش سەتڵێك بوو لە گۆشەیەکدا دانرابوو.

دیسانیش بەندییەکان بەکەیف و ورەبەرز بوون.
زۆریان وەك نێڵسۆن ماوەی دوورودرێژ
قەدەغەی تەواویان لەسەر بوو.
ڕێگەیان نەدابوون یەکتری ببینن.
ئێستا دوژمنەکەیان هەموویانی لە بەندیخانەیەکدا کۆ کردبوونەوە و
دەیانتوانی شەووڕۆژ هەر خەریکی باسوخواسی سیاسەت بن.

بۆ ئەوەی بە هەموو شتێکدا ڕابگەن بەرنامەیەکیان ڕێك خستبوو،
کە وەرزش و گۆرانی و ئاخاوتنیان لە خشتەکەدا دانابوو.
دوای دوو حەفتە ئەو ١٥٦ بەندییەیان
بە سواریی چەند پاسێکی داخراو و لەگەڵ پاسەوانی چەکداردا نارده دادگا.
شەقامەکان پڕ بوون لە خەڵکی خۆپێشاندەر کە
گۆرانییان دەگوت و هاواریان دەکرد.
خەڵکەکە ئەوەندە زۆر بوون کە هاتوچۆ لە جووڵە کەوت.
بەندییەکان گوێیان لە هاواری خەڵکەکە بوو،
ئەوانیش بۆیان دەسەندنەوە.
دەتگوت ئەو پاسە گەورانە بە دەم
گۆرانیچڕینی ئەو هەموو خەڵکەوە لەسەرخۆ
وەك بێشکە بۆ پێشەوە و بۆ دواوە ڕادەژەنران.



حەشاماتێکی خەڵك لە دەرەوەی دادگا

ژنانی تۆمەتبارکراو لە قەفەسی تەلیندا ڕاگیرابوون

کە بەندییەکان لە ساڵۆنی دادگا کرانە ژوورەوە، بە شانازییەوە
پەنجەکەڵەیان بەرز دەکردەوە. ئەمە سەڵاوی ANC بوو.
پاشان هەموویانیان خستنە نێو قەفەسێکی گەورە و پانوپۆڕەوە
کە لە تەلی پۆڵایین دروست کرابوو.
دادوەری گشتی دەیگوت گوایە ئەمانە کۆمونیستن و
ویستوویانە حوکومەتی ئەفریقای باشوور بە زۆر بڕووخێنن.
هاوار و گۆرانیی خەڵکەکەی دەرەوە ساڵۆنی دادگای
وەها پڕ کردبوو کە دەنگی دادوەری گشتی
بە ئاستەم دەبیسترا.
لەپڕ پۆلیس دەرپەڕینە دەرەوە و خەڵکەکەیان
ڕاستەوڕاست دایە بەر گوللە؛
بیست کەس بریندار کران.



پرۆتێست دژی دادگاییکردنەکە لە ئەفریقای باشوور و
لە وڵاتانی دیکەیش پەرەی سەند.
خەڵکی دەستیان کرد بە کۆکردنەوەی کۆمەك بۆ ئەوەی زیندانییەکان
ئازاد بکرێن.
پارێزەرانی بەرگری هەڕەشەیان کرد کە ساڵۆنی دادگا بە جێ دەهێڵن،
چونکە بەندییەکان وەك ئاژەڵی کێوی تەماشا دەکران.
ئەوجا قەفەسەکە هەڵوەشێنرایەوە و
ڕۆژی چوارەم بەندییەکان بە کەفالەت ئازاد کران.
ئەپارتهاید تەنانەت لە زیندانیشدا نرخی جیاوازی
بۆ مرۆڤەکان دانابوو:
٢٥٠ پۆند بۆ سپییەکان، ١٠٠ پۆند بۆ هندییەکان و
٢٥ پۆند بۆ ڕەشەکان و ڕەنگدارەکان.

دادگاییکردنەکە دەبوو دواتر بەردەوام بێت.
داوالێکراوەکان دەیانتوانی لە ماڵەوە بمێننەوە،
بەڵام دەبوو هەموو حەفتەیەك لای پۆلیس خۆیان ناونووس بکەن و
ڕێگەیشیان نەدەدان سەفەر بکەن و لە کۆبوونەوەکاندا ئامادە بن.
ئێڤیلین لە زینداندا سەری لە نێڵسۆن دابوو.
ئەوانیش شەڕێکی خۆیان هەبوو. شەڕەکەیان
لەسەر پەروەردەکردنی منداڵەکان بوو.
نێڵسۆن دەیویست فێری سیاسەتیان بکات و
ئێڤیلینیش دەیویست دیندار بن.

کە نێڵسۆن لە بەندیخانە دەرچوو،
ماڵەکەی چۆڵوهۆڵ و بێدەنگ بوو.
ئێڤیلین باری کردبوو، منداڵەکانیشی لەگەڵ خۆی بردبوو.

ئەو ١٥٦ کەسەی تۆمەتبار کرابوون لە دادگاییکردنی
خیانەتی باڵادا. نێڵسۆن ماندێلا لە ناوەڕاستی ڕیزی
سێیەمدایە لە خوارەوە.



١٤ی حوزەیرانی
١٩٥٨، نێڵسۆن و
وینی لە کڵێسای
گوندەکەی ویننیدا

## خۆشەویستیی ویننی

یەکەم جار کە نێڵسۆن چاوی بە نۆمزامۆ وینیفرید مادیکیزێلا کەوت، ڕاوەستابوو چاوەڕێی پاسی دەکرد.
نێڵسۆن بە ئۆتۆمۆبیل بە لایدا تێپەڕی و ئاوڕی دایەوە تا ئەو کچە گەنج و جوانە چاکتر ببینێت.

لە پاش چەند حەفتەیەك وینی، کە بەم ناوە بانگ دەکرا و دەناسرا،
هات بۆ نووسینگەکەی ئۆلیڤەر و نێڵسۆن،
چونکە پێویستی بە یارمەتیی پارێزەرێك بوو.
نێڵسۆن پێی سەیر بوو، زۆریش دڵخۆش بوو،
کە چاوی بە ژنە گەنجەکەی وەستگەی پاسەکە کەوتەوە.
نێڵسۆن دەستی پیّ کرد بایەخ بە وینی بدات و
لەگەڵ خۆی دەیبرد بۆ کۆبوونەوە سیاسییەکان.
باسی دادگاییکردنەکە و باسی
هیوا و ئاواتی پاشەڕۆژی بۆ کرد.
هەر پێشەکی دەیزانی دەیەویّ بیخوازیّ.
وینی دەهات بۆ تەماشاکردنی نێڵسۆن کاتیّ
مەشقی بۆکسێنی دەکرد.
تێمبییش دەهات بۆ جێگەی بۆکسێنەکە،
بەڵام پێی خۆش نەبوو باوکی ژنێکی دیکەی دەبینی.

نێڵسۆن لە ئێڤیلین جیا بووەوە و دەستی پیّ کرد نەخشە بۆ زەماوەندی
خۆی و وینی بکێشێت.
شیربایی دا بە باوکی وینی. ئەمە
وەك نەریتێك نرخی بووك بوو.
پۆلیس ڕێگەیان پیّ دا شەش ڕۆژ دوور بکەوێتەوە.
نێڵسۆن و وینی چوون بۆ دێیەکەی وینی تا زەماوەند بکەن.

لە ئاهەنگی دوای زەماوەندەکەدا
باوکی وینی بۆ کچەکەی ئاخاوت.
باسی ئەوەی کرد چەند خۆشی دەوێت و
هیوای بەختیاریی بۆ خواست.
ئەوەیشی پیّ گوت کە تۆ شوو بە پیاوێك دەکەیت
کە پێشتر سیاسەت و خەباتی کردۆتە هاوسەری خۆی.

نۆبووك و نۆزاوا نە پارەیان هەبوو، نە کات،
بچن مانگی هەنگوین ببەنە سەر.
چوونە ناو خانووەکەی نێڵسۆن لە سۆوێتۆ.
ئێستا ئیتر ژیانی وینی وەك ژنی
ئازادیخوازێك دەستی پیّ کرد.



وینی وێنەیەکی نێڵسۆنی لە جانتاکەیدا هەڵگرتبوو




حوکوومەت دەیویست قانوونی پاسپۆرت بەسەر ژنانیشدا بسەپێنێ. بەڵام ژنان پرۆتێستیان کرد.

## خەباتی ژنان

وینی بەشی کارگەری کۆمەڵایەتیی خوێندبوو و
لە نەخۆشخانەیەکی گەورەی جۆهاننەسبورگ کاری دەکرد.
نێڵسۆن ئەرکی ژیاندنی سێ منداڵی لەسەر بوو و
خێزانەکەیان پێویستی بە مووچە کەمەکەی وینی بوو.

دەستگای پارێزەریی ماندێلا و تامبۆ وەك جاران هەرمێن و برەوی نەمابوو.
ئۆلیڤەر و نێڵسۆن هەردوویان
بە خیانەت تاوانبار کرابوون و دادگاییکردنێکی دوورودرێژ
دژیان هەر بەردەوام بوو.
نووسینگەی پارێزەرییەکەیان زۆرجار دەبوو داخرێت.

چەند مانگێك دوای زەماوەند وینی بڕیاری دا
لە خۆپێشاندانێکدا دژی قانوونی پاسپۆرت بەشداری بکات.
نێڵسۆن شانازیی پێوە دەکرد، بەڵام نیگەرانیش بوو،
چونکە وینی دووگیان بوو، وریای کردەوە
کە لەوانەیە بگیردرێت.
سەدان ژن لە ناوەندی شاری جۆهاننەسبورگدا کۆ بوونەوە.
هەر زوو پۆلیسی چەکدار گەمارۆیان دان.
هەموویان گیران و ڕەوانەی ″قەلا″ کران.

لەوێ فەرمانیان پێ کردن کە هەموو جلەکانیان داکەنن،
بە چیچکانەوە دانیشن و قاچیان بڵاو بکەنەوە.
پاسەوانەکان زۆر بە وردی و بە سەختی کەوتنە پشکنینیان.
لە دووەم حەفتەی بەندیخانەدا ویننی تووشی خوێنپژان بوو،
جێگەکەی خۆی بە تەنیشت جێگەی ژنەکەی والتەر سیسولووەوە ڕاخست.
ویننی لای ئەو هەستی بە دڵنیایی دەکرد.
ئالبێرتینا سیسولو بەتەمەنتر بوو، نەخۆشەوانیش بوو.
ئەو ویننیی هێمن کردەوە و خوێنپژانەکەیش وەستا.
لە دەرەوەی زیندان خۆپێشاندانەکان بەردەوام بوون و زیاتر و زیاتر ژنان دەگیران.
لە دواییدا دووهەزار ژن چاوەڕوانی دادگاییکردن بوون.
خواردن بۆ هەموویان نەبوو، جێگەیش لە ژوورەکانی
بەندیخانەکەدا نەبوو لەسەری پاڵ بکەون و بخەون.

بە یارمەتیی پارەی خڕکراوەوە
ژنەکان بە کەفالەت ئازاد کران.
بەڵام کە ویننی لە بەندیخانە هاتە دەرەوە
هیچ کارێکی نەبوو، چونکە
لە کاری نەخۆشخانەکە دەرکرابو.
لە شوبات (فەبریوەری)ی ۱۹۵۹ یەکەم منداڵی خۆی و نێڵسۆنی بوو،
کچێك بوو، ناویان نا زێنانی.
دوو ساڵ دواتر کچی دووەمیان، زیندزیسوا، لە دایك بوو.





## دەستڕێژەکەی شارپڤیل

پرۆتێست و ناڕەزایی دژی قانوونی پاسپۆرت لە هەموو وڵاتدا بەردەوام بوو.
پارتیی سیاسیی تازەدامەزراوی PAC هەمووانی هان دا
کە پاسپۆرتەکانیان لە ماڵ بە جێ بهێڵن، با پۆلیس بیانگرێ.

شارپڤیل شارێکی بچکۆلەیە لە خوار جۆهاننەسبورگەوە.
لەوێ دەهەزار کەس گەمارۆی ناوەندی پۆلیسیان دا.
خۆپێشاندەران بێچەك بوون، بەڵام پۆلیس هار بوون و
لەپڕ خەڵکەکەیان دایە بەر دەستڕێژی گوللە.
لە ماوەی چەند دەقیقەیەکدا ٦٩ کەس کوژران.
زۆربەی ئەمانە لە پشتەوە، لە کاتی ڕاکردندا، پێکرابوون.
سەدان کەسیش بریندار کران، بەشێکی زۆریان ژن و منداڵ بوون.
وڵات ئاژاوەی تێ کەوت و هەموو دنیا پرۆتێستی کرد.
ئەنجومەنی ئاسایشی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان
گوناهەکەی خستە ئەستۆی حکوومەتی ئەفریقای باشوور.

نێڵسۆن ماندێلا دوودڵ بوو.
دەیتوانی چی بکات؟
ANC دەیتوانی چی بکات؟

سەرخێڵ لوتولی سەرۆکی ANC بوو.
پێنج ڕۆژ دوای کارەساتەکەی شارپڤیل،
سەرخێڵ پاسپۆرتەکەی خۆی لە پریتۆریای پێتەختی ئەفریقای باشوور سووتاند.
پاشان خەڵکەکەی هان دا ئەوانیش وا بکەن.
سەرخێڵ بڕیاریشی دا ڕۆژی ٢٨ی مارت، ڕۆژی پرسەی
سەرتاسەری بێت لە وڵاتدا.
کارگەران دەبوو لە ماڵدا بمێننەوە و نەچنە سەر کار.

چەند سەدهەزار کارگەر گوێڕایەڵی هاندانەکەی سەرخێڵ بوون.
وەرامی حکوومەت ئەوە بوو کە ANC و PACی قەدەغە کرد.



نێڵسۆن ماندێلا پاسپۆرتەکەی خۆی
دەسووتێنێ لە سۆوێتو



شارپڤیل، ٢١ی مارتی ١٩٦٠، ٦٩ کەس بەدەستی پۆلیس کوژران و ١٨٠یش بریندار کران.



نێڵسۆن ماندێلا و هاوڕێکانی دوای ئازادکردنیان لە تۆمەتەکان سروودی ”نکۆس سیکێلێل ئیئافریکا”، خودا ئەفریقا بپارێزێ، دەخوێنن، ٢٩ی مارتی ١٩٦١



# مێخەکەڕەش

نێڵسۆن ماندێلا هێشتا بە خیانەت تاوانبار کرابوو.
دادگاییکردنە دوورودرێژەکە چوار ساڵی پێ چوو تا بڕایەوە.
داواکاری گشتی نەیتوانی بیچەسپێنێ
کە ANC ڕێکخراوێکی کۆمونیستییە و دەیەوێ
حوکوومەت بە زۆر بڕووخێنێ.
هەموو تاوانبارکراوەکان بە بێتاوان دەرچوون.

نێڵسۆن ماندێلا ویستی لەگەڵ هاوڕێکانیدا ئاهەنگێ بگێڕێ و
دەیویست چاوی بە ماڵ و منداڵەکەی خۆی بکەوێ،
بەڵام نەیوێرا بچێتەوە بۆ ماڵ.
دەیزانی پۆلیس دەیەوێ سەرلەنوێ بیگرێ.
ئۆلیڤەر تامبۆ ئەو کاتە وڵاتی بە جێ هێشتبوو.

لەو کاتەوە ئیتر نێڵسۆن ماندێلا بوو بە پیاوی شەو.
لەناو وڵاتەکەی خۆیدا بە شاراوەیی دەژیا.
ڕۆژان لە خانووی چۆڵدا، یا لە نووسینگەدا، خۆی دەشاردەوە
تا بتوانێ تەنیا بێت و
شەوانیش کاری دەکرد.

قژی خۆی بەردایەوە و وازی لە ڕیشتاشین هێنا.
لە ڕێکردندا تۆزێ خۆی کووڕ دەکردەوە و جلەکانی گۆڕی،
بۆ ئەوەی وەك باغچەوانێك یا وەك چێشتلێنەرێك دیار بێت.
کە ماشێنی لێ دەخوڕی
شەپقەیەکی نایلۆنی لەسەر دەکرد و
خۆی وەك شۆفێرێك دەگۆڕی.



پۆلیس زاڵگەی لەسەر ڕێگاکان دانابوو بۆ کۆنترۆڵکردنی
ئەوانەی ماشێنیان دەئاژۆت.
بە ڕۆژدا پۆلیسی عەسکەری بەناو شارە تەنەکەکاندا،
سواری زرێپۆش دەبوون و هاڕەهاڕ دەهاتن و دەچوون.
شەوانیش بە هەلیکۆپتەر دەهاتنەوە و بەسەریاندا دەسووڕانەوە.
چرا ڕووناکیپڕژێنەکانی هەلیکۆپتەرەکان
شەقامە قوڕاوییەکانی گەڕەکە تەنەکەکانی دەکردە ڕۆژی نیوەڕۆ.
بەمە خەڵکەکەیان دەترساند.

نێڵسۆن ماندێلا بەردەوام دەکەوتە بەردەم مەترسیی گەورە.
بە هەموو وڵاتەکەدا سەفەری دەکرد،
لە کۆبوونەوەی نهێنیی شەوانەدا بەشداریی دەکرد و
مانگرتنی ڕێك دەخست.

لەپڕ لە جێگایەکەوە، کە کەس باوەڕی نەدەکرد
لەوێ بێت، سەری دەردەهێنا،
هەر بەو شێوەیەیش لەپڕ ون دەبوو.
بەوە ڕاهاتبوو بە حوکوومەت و پۆلیس ڕابوێرێ؛
تەلەفۆنی بۆ ڕۆژنامە و دەستگای جیاوازی دەستەڵات دەکرد.
تووڕەی دەکردن و دەیگوت: تەماشا کەن، ئێوە چەند بێکەڵکن.
ئێوە من ڕاو دەنێن و ئەوەتا من ئازادم!
لە ڕۆژنامەکاندا ناویان نابوو ″مێخەکەڕەش.″
حوکوومەت ڕقی لێ بوو، بەڵام خەڵکی هەژار خۆشیان دەویست.
ئەو پاڵەوانی هەژاران بوو؛
بوێریی ئەو وای لێ دەکردن کۆڵ نەدەن.



مێخەکەڕەش



سوپا زرێپۆشەکانی خۆیان لە شارۆچکە تەنەکەکاندا دەئاژۆن



## خەباتی چەکدارانە

ANC دەیویست بە بێ بەکارهێنانی زۆر ئەفریقای باشوور بگۆڕێت،
بەڵام حوکوومەت، بەپێچەوانەوە، هەمیشە زۆری بە کار دەهێنا،
خەڵکی بێتاوان ڕاو دەنران، بەند دەکران، ئەشکەنجە دەدران و دەکوژران.

زۆر لە خەڵکی ئەفریقای باشوور دەیانگوت: ئیتر بەسە!
نامانەوێ بمرین! ئێمەیش دەبێ دەست بوەشێنین!

زۆر لە ئەندامە بەتەمەنەکانی ANC دەیانویست
لەسەر خەباتی ئاشتییانە بەردەوام بن.
لە ماوەی پەنجا ساڵدا ANC بانگەشەی بۆ ناتوندوتیژی کردبوو،
ئێستا دەکرا واز لە باوەڕی خۆی بهێنێ؟
دەکرا خەباتکارانی ئاشتیخواز ئێستا ببنە جەنگاوەر؟

ئەوانەی گەنجتر بوون بێتەحەمول بوون، بە هەڵچوونەوە دەیانگوت:
– توندوتیژی هەمیشە لە ئارادایە! شەڕە و بەرۆکمانی گرتووە.

نێڵسۆن ماندێلا لەگەڵ گەنجەکاندا بوو.
بوو بە سەرکردەی ڕێکخراوێکی تازەی عەسکەری
کە پێی دەگوترا نێزەی نەتەوە.
ئەو پێشتر سەربازیی نەکردبوو، هەرگیز
گوللەیەکیشی نەنابوو بە دوژمنێکەوە.
ئێستا دەبوو ببێتە سەرکردەی لەشکرێکی شەڕکەر.
نێڵسۆن ماندێلا تێگەیشتبوو کە ئەرکە تازەکەی
لە هەموو ئەو شتانەی پێشتر کردبوونی خەتەرناکتر بوو.
بەڵام ئەو زۆر چاك بیری لەم هەڵبژاردنە کردبووەوە.
لە یەکێك لە حەشارگەکانیەوە نامەیەکی بۆ گەلەکەی نووسی.
″من ژیانێکم هەڵبژاردووە کە لە ژیانی زیندان
هەم زەحمەتترە و هەم خەتەرناکتر.
من دەبێ دوور لە ژنە خۆشەویستەکەم و لە منداڵەکانمەوە و
دوور لە دایکم و خوشکەکانمەوە بژیم.
من لە وڵاتەکەی خۆمدا بێئاساییشم.
ناچار کراوم نووسینگەکەم دابخەم و واز لە کارەکەم بهێنم.
دەبێ وەك زۆر کەسی دیکەی گەلەکەم بە هەژاری بژیم.
شان بە شانی ئێوە دژی حوکوومەت خەبات دەکەم.
مەتر دوای مەتر و کیلۆمەتر دوای کیلۆمەتر،
تا بەدەستهێنانی سەرکەوتن.
تۆ نیازت هەیە چی بکەیت؟
دەتەوێ لەگەڵ ئێمە بیت؟
یا دەتەوێ هاوکاریی ئەو حوکوومەتە بکەیت
کە گەلەکەت دەچەوسێنێتەوە؟
من ڕێگەی خۆمم هەڵبژاردووە.
خەبات ژیانی منە.
من هەتا لە ژیاندام بەردەوام لە پێناوی ئازادیدا شەڕ دەکەم.″

نامەکەی نارد بۆ ڕۆژنامەکان.
نامەکە بڵاو کرایەوە و خەڵکی ئەفریقای باشوور لە سەرتاسەری
وڵاتدا خوێندیانەوە.



کارێکی تێکدەرانە دژی تانکێکی نەوت.

## خەبات سەختتر دەبێت

نێڵسۆن ماندێلا چەند مانگێك بوو خۆی شاردبووەوە
کە هاوڕێکانی حەشارگەیەکی سەلامەتیان بۆی دۆزییەوە،
کێڵگەیەکی لادێ بوو لە ڕیڤۆنیا، لە دەرەوەی جۆهاننەسبورگ بۆ ئەوەی تێیدا دانیشێ.

شتی هەرە چاکی ئەم کێڵگەی لادێیە ئەوە بووکە وینێ و
منداڵەکان دەیانتوانی بێنە ئەوێ و بە نهێنی سەری لێ بدەن.
منداڵەکان ئەوە فێر بوون کە ئاشکرای نەکەن
باوکیان لە کوێ خۆی شاردووەتەوە.

وینێ و نێڵسۆن ماوەیەکی کورت دەیانتوانی بە تەنیا پێکەوە بن.
ئەوان تاسەی یەکتریان دەکرد و یەکدییان لە ئامێز دەگرت.
لەوساوە کە بووبوونە ژنومێرد نێڵسۆن هەر ڕاونراو بوو.
بە ڕۆژدا نێڵسۆن جلی خزمەتکاری لە بەر دەکرد.
سەرنجی ئەوەی دەدا کە هەندێ ئەفریقایی بە شێوەیەکی خراپ
هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکەن، ئەگەرچی ئەوانیش وەك خۆی ڕەش بوون.
نەیاندەزانی ئەو پیاوەی زەوییەکەی گسک دەدا و
پیسی و خۆڵ و خاشاکی فڕێ دەدا

پاڵەوانی ئازادیی خۆیان بوو.
بە لووتبەرزییەوە بانگیان دەکرد: بۆی! کوڕە!
ئا دەی زوو چایەکمان بۆ ئامادە کە!
نێڵسۆن زوو بە گوێی دەکردن، چای پێشکەش دەکرد.
ئەوجا دەبوو بێدەنگ ڕاوەستێت و چاوەڕوان بێت تا
فنجانەکان بشۆرێت.

بە شەوان خزمەتکارەکە دەگۆڕا و دەبوو بە سەرکردەی گەل.
لەگەڵ هەڤاڵانیدا کاری تەقاندنەوە و
ڕووخێنکاریی ئامادە دەکرد.

ڕۆژی ١٦ی کانوونی یەکەمی ١٩٦١
یەکەمین بۆمبە ماڵکردەکان
تەقینەوە و زیانیان گەیاندە دەستگای کارەبا و چەند
ساختمانی حوکوومەت لە سێ شاری گەورەدا.
خەبات سەختتر بوو.
ANC ئەرکی نوێی بە نێڵسۆن ماندێلا سپارد.
سەفەری دەرەوەی وڵاتی کرد بۆ پەیداکردنی پشتگیری
بۆ شەڕی ئازادیخوازی و بۆ ئەوەی
لە ڕووی عەسکەرییەوە خۆی پێ بگەیێنێت.
بە ناوی ساختەوە و بە پاسپۆرتی ساختەوە سەفەری کرد و
چاوی بە سەرکۆمار و سەرکردەی گەلێ وڵات کەوت.

هێڵێکی تێکدراوی وزەی کارەبا.





ئۆلیڤەر تامبۆ و نێڵسۆن ماندێلا لە ئەدیس ئەبەبا

چاویشی بە ئۆلیڤەر تامبۆی هاوڕێی کەوت کە
لە دەرەوە دەژیا و بۆ ANC کاری دەکرد. نێڵسۆن ماندێلا سەفەری دەرەوەی وڵاتی پێ خۆش بوو.
بینینی ئەوەی کە چۆن ڕەش و سپی لە یەك ڕێستۆراندا
نان دەخۆن و
لە پاسەکاندا بە تەنیشت یەکەوە دادەنیشن و
دەچوونە هەمان سینەما و لە یەك هۆتێلدا دەخەوتن.
نێڵسۆن هەرگیز شتی وای نەئەزموو‌بوو.
ئەمە یەکەم جار بوو لە ژیانی گەورەییدا هەستی دەکرد ئازادە.

# مێخەکەڕەش خیانەتی لێ دەکرێت

ئازادی زۆر درێژەی نەکێشا.
کە نێلسۆن ماندێلا گەڕایەوە بۆ ئەفریقای باشوور گیرا.
ڕۆژی پێنجی ئاب (ئاوگوست)ی **١٩٦٢** ماشینەکەی ڕاگیرا.
کەسێك پۆلیسی تێگەیاندبوو.
مێخەکەڕەش خیانەتی لێ کرابوو.

نێلسۆن برا بۆ بەندیخانەی جۆهانەسبورگ و
لە ژوورێکی تەنیاکەسیدا دەرگای لەسەر داخرا.
هەرچی بیری دەکردەوە ئازاری پێ دەگەیشت.
نەیدەزانی کێ خەبەری لێ داوە،
ئایا کەسێکی دۆست بوو یا دوژمن؟ کەسێکی ناو ANC بوو؟
یا تەنانەت کەسێکی ناو خێزانەکەی خۆی بوو؟

بەندیخانەکە بێدەنگ بوو.
دەنگی کۆکەیەك لە ژوورێکی نزیکەوە دەبیسترا.
کۆکەکە تایبەت بوو. یەکجار ئاشنا دەهاتە بەرگوێ.
نێلسۆن لەسەر جێگەی نووستنەکەی دانیشت و قیڕاندی: والتەر؟!

دەنگێك وەرامی دایەوە: نێلسۆن، ئەوە تۆی؟

ئەمە هاوڕێ کۆنەکەی بوو؛ والتەر سیسولو!
ئەو دوو هاوڕێیە نەیاندەزانی دەبوو پێبکەنن یا بگرین.
هەموو شەوەکە لە دیوارەکەی نێوانیانەوە قسەیان کرد.
نێلسۆن نەیدەویست بۆ بەرگریکردن پارێزەری بۆ دابنێن،
چونکە بێتاوان بوو!
بیری لەوە کردەوە شکات لەوانە بکات کە حوکمی
ئەفریقای باشووریان دەکرد.
ئەوان بوون کە تاوانباری چەوسانەوە و ڕەگەزپەرستی بوون.



لێپرسینەوە بەیانیی دووشەممەیەك دەستی پێ کرد.
نێڵسۆن جۆرە پاڵتۆیەکی دابوو بە خۆیدا لە پێستی لیۆپارد دروست کرابوو.
پاسەوانەکانی زیندان فەرمانیان دا: ماندێلا! ئەو پەتۆیە لا بە!

سەرنجیان دا کاتێ بەندییەکانی دیکە، چاویان بە نێڵسۆن کەوت
بە شانازییەوە جلە ئەفریقاییەکانی لە بەر کردووە
تووشی جۆرێ یاخیبوون و ڕاپەڕین بوون.
بەڵام نێڵسۆن ملی نەدا چاکەت لە بەر بکات و ملپێچ ببەستێت.

کە بردیانەوە ژوورەوە بۆ سالۆنی دادگا، تەماشاکەران هەموو
لە بەری هەڵستان و هاواریان کرد: ئاماندلا! دەستەڵات!


وینی لەگەڵ ئەوانەدا کە دۆعای خێریان بۆ دەکرد

وینی لەناو تەماشاکەراندا دانیشتبوو.
ئەویش جلی بە مرواری نەخشێنراوی گەلی خۆسای لە بەر کردبوو.

نێڵسۆن بەوە تاوانبار کرا کە کارگەرانی ئافریقای باشووری هان داوە مان بگرن.
هەروەهایش بەوەی کە بە بەڵگەی ساختەوە سەفەری دەرەوەی وڵاتی کردووە.
سزای پێنج ساڵ بەندکردنیان بۆ بڕییەوە.

نێڵسۆن ماندێلا دەبوو واز لە پاڵتۆ لیۆپاردەکەی بهێنێت.
لەجێی ئەوە جلی ئاساییی زیندان، هیی ڕەشەکانی وەرگرت.
ئەم جلانە جووتێ شەرواڵی کورت، کراسێکی زبر، چاکەتێك، گۆرەوی،
سەرپێیی و کڵاوێك بوون.
نێڵسۆن پرۆتێستی کرد و وتی شەرواڵی کورت لە بەر ناکەم.
وتی خۆ من کوڕ نیم.
دەیویست وەك بەندییە سپییەکان پانتۆڵی درێژ لە پێ بکات.
کە پاسەوانەکانی زیندان خواردنیان هێنا ڕەفزی کرد بیخوات.
شیوەکە شۆرباوێکی سارد و نیوەی کەوچکەچایەك شەکەر بوو.
پاسەوانەکان پێشنیازیان بۆ هێنا:
نێڵسۆن دەیتوانی پانتۆڵی درێژ و خواردنێکی دیکەیش وەربگرێت
ئەگەر ڕازی بێت بخرێتە ژوورێکی تاکەکەسییەوە. نێڵسۆن وتی باشە.

لە ماوەی دوو حەفتەدا بە تەواوی تەنیا بوو.
تاکە دەموچاوێکی نەبینی.
تەنانەت دەنگی بەندییەکی دیکەی بەر گوێ نەکەوت.
ڕووناکیی ڕۆژ نەدەهاتە ناو ژوورەکەی.
لە بنمیچەکەوە گڵۆپێك ئاوێزان بوو کە لە شەووڕۆژێکدا
بیستوچوار سەعات داگیرسابوو.

کاتژمێری نەبوو، هیچی لا نەبوو بیخوێنێتەوە، هیچی نەبوو پێی بنووسێت.
لە هەمووی خراپتر ئەوە بوو کەسێك نەبوو قسەی لەگەڵ بکات.
لە دواییدا وای لێ هاتبوو، نەبێتە درۆ، دەستی پێ کرد لەگەڵ سێبەرەکاندا قسە بکات.
ئەوسا ئیتر شەرواڵی کورتی لە بەر کرد و ژووری تەریککردنی لە بەندییەکانی تری بە جێ هێشت.
بەرگەی تەنیابوونی نەگرت.

نێڵسۆن ماندێلا نۆ مانگی لە سزاکەی بردبووە سەر،
لەپڕ بردیانەوە بۆ ساڵۆنی دادگا.
پۆلیس حەشارگەکەی ڕیڤۆنیای بۆ ئاشکرا بووبوو،
سەدان نەخشە، نامە، کتێب، ڕادیۆنێر و بەڵگەیان
لەسەر "نێزەی نەتەوە" دۆزیبووەوە.
والتەر سیسولو و گەلێکی تریش لە هاورێیانی نێڵسۆن
خرابوونە زیندانەوە.
بەوە تاوانبار کرابوون کە پێشمەرگە و کۆمونیستن.
داواکاری گشتی دەیویست حوکمەکەیان ئەوە بێت لە سێدارە بدرێن.

دادگاییکردنەکە چەند مانگێك بەردەوام بوو.
ئاخاوتنی بەرگرییەکەی نێڵسۆن ماندێلا چوار سەعاتی خایاند.
دانی بەوەدا نا کە لە نەخشەبۆدانانی ڕووخێنکاریدا بەشداریی کردووە،
بەڵام کۆمونیست نییە.

ماندێلا وتی: من دژی دەستەڵاتی سپییەکان خەباتم کردووە.
دژی دەستەڵاتی ڕەشەکانیش خەباتم کردووە.
من کۆمەڵگەیەکی دیمۆکرات و ئازادم دەوێ، هەموو
مرۆڤەکان ئیمکانی وەکیەکیان هەبێت.
ئەمە ئامانجێکە هیوادارم بۆی بژیم،
بەڵام ئەگەر پێویست بێت، ئەوا ئامانجێکە
ئامادەم بۆیشی بمرم.

بەندییەکان پێیان وا بوو سزای مەرگ دەدرێن.
کە دادگەر حوکمەکەی خوێندەوە لە ساڵۆنی دادگاکەدا بوو بە هەرا،
کەس گوێی لێ نەبوو حاکم چیی وت.
ژنی یەکێ لە بەندییەکان هاواری لە مێردەکەی کرد: سزاکە چی بوو؟
بەندییەکە قیڕاندی و وەرامی دایەوە:
– هەموو ژیان لە بەندیخانەدا! دەتوانین بژیین!



دورگەی ڕۆببین لە دەرەوەی کەیپ تاون

# بەندیخانەی دورگەی ڕۆببین

بەندییەکان گوێزرانەوە بۆ دورگەی ڕۆببین،
دورگەزیندانێکی بچکۆلەیە هەموو لایەکانی زەریایەکی شەپۆلدار گرتوویەتی.
لێرەوە ئیدی کەس نەیدەتوانی هەڵبێت.
دەبوو ئەو ژیانەی ماویانە لێرەی ببەنە سەر.



حەوشەی بەندیخانەکەی دورگەی ڕۆببین

نێڵسۆن ماندێلا بوو بە زیندانیی ژمارە: ٦٤–٤٦٦.
ئەوێك کە حەزی لە جلی جوان و مۆسیقا و خواردنی خۆش بوو،
ئێستا دەبوو لە حەوشەیەکی داخراوی زینداندا دابنیشێت و
بەرد ورد بکات و بیکاتە وردەبەرد.

سێ مانگی پێ چوو تا وینني توانیی بێتە سەردان.
نێڵسۆن تەنیا دەیتوانی لە پەنجەرەیەکی بچووکەوە بیبینێت،
ئەویش بە شێوەیەکی تەماوی و ناڕوون.

لە ژووری سەردانەکەدا دیوارێك لەنێوانیاندا هەبوو،
دەبوو بقیرێنن بۆ ئەوەی گوێیان لە یەکتر بێت.
ئەگەر گلەیی و گازندەیەکیان بکردایە یا باسی سیاسەتیان بکردایە
یەکسەر قسەکەیان پێ دەبڕین.
لەپشت نێڵسۆنەوە سێ پاسەوان ڕاوەستابوون و گوێیان دەگرت،
لەپشت وینني‌شەوە دوو.

لەپڕ یەکێك لە پاسەوانەکان هاواری کرد:
– کاتەکە تەواو بوو!
سی دەقیقە تێپەڕیبوو.
چۆن دەکرا کاتەکە وا زوو بڕوا؟
دەیویست زۆر شت بە ژنەکەی بڵێ.
ئێستا دوو ساڵی تری پێ دەچوو تا سەردانی داهاتووی ویننی.

بەندییەکان دەیانتوانی هەر شەش مانگ جارێك نامە بنووسن و نامەیان بۆ بێت و نامەکانیش دەبوو لە پێنجسەد وشە زیاتر نەبن.
نێڵسۆن نامەی بۆ خێزانەکەی دەنووسی، هەوڵی دەدا دڵی ژنەکەی بداتەوە، هەوڵی دەدا منداڵەکانی پەروەردە بکات.
ژیانی لە بەندیخانەدا زەحمەت بوو، بەڵام زۆرجار بیری لەوە دەکردەوە ئەوانەی لە دەرەوەی بەندیخانە بوون ژیانیان سەختتر بوو.
وینییش خرایە زیندانەوە.
قەدەغەی تەواوی خرایە سەر و خۆی و منداڵەکانی لە ماڵەکەیان دوور خرانەوە.
نێڵسۆن نەیدەتوانی هیچ بکات بۆ یارمەتیدانی خێزانەکەی.



نێڵسۆن ماندێلا جلێکی
بەندیخانە دەدوورێتەوە

نزیکەی هەزار بەندی لە دوورگەی ڕۆببین هەبوون.
دوورگەزیندانەکە بە تەواوی بەپێی ڕەگەز جیا کرابووەوە.
یەك دانە زیندانیی سپیی لێ نەبوو، یەك دانە پاسەوانی ڕەشیشی لێ نەبوو.

نێڵسۆن ماندێلا و هەڤاڵەکانی لەسەر تاوانی سیاسی حوکم درابوون.
بەندییەکانی تر لەو تاوانبارانە بوون کە دزییان کردبوو،
خەڵکیان کوشتبوو یا ژنی خەڵکیان زەوت کردبوو.
ڕێبەرایەتیی زیندان ئەو تاقمە جۆراوجۆرانەی لە یەکدی جیا کردبووەوە.
نەوەك بەندییە سیاسییەکان کار بکەنە سەر بەندییەکانی دیکە.
بەڵام هەندێ جاریش تاوانکارێك دەخرایە ناو بەندییە سیاسییەکانەوە
بۆ جاسووسیکردن یا هەر بۆ شەڕنانەوە.
"بۆگارت" تاوانکارێکی وەها بوو.
ناوەکەی خۆی لە ناوی هونەرپیشەیەکی ناوداری ئەمەریکاییەوە وەرگرتبوو.
ژوورەکەی بۆگارت بەرامبەر ژوورەکەی والتەر سیسولو بوو.
هەموو بەیانیەك بۆگارت داوای دەکرد بەرچاییەکەی والتەری بدەنێ و والتەر نەیدەوێرا نەیداتێ.

بەندییەکان نەیاندەتوانی ڕۆژنامە بخوێننەوە یا گوێ لە ڕادیۆ بگرن.
پاسەوانەکان بە قەیچی (مەقەس) نامەکانیان بە جۆرێك دەبڕی
کە دەنگوباس و پەیامە گرنگەکان بفەوتێن. کاتژمێر قەدەغە بوو.

دەیانویست ویست و سەربەرزیی بەندییەکان تێك بشکێنن،
بەڵام بەندییە سیاسییەکان زۆر بایەخیان بەوە دەدا کە ڕێزی خۆیان بپارێزن.
نێڵسۆن ماندێلا ساڵنامەیەکی لەسەر دیواری ژوورەکەی دروست کردبوو
تا بزانێت چ ڕۆژێکە.
ئەگەرچی ژوورەکە بچووك بوو هەموو بەیانییەك وەرزشی دەکرد.
لە پێشدا لەو جێگایەدا ماوەی ٤٥ دەقیقە ڕای دەکرد،
پاشان خۆی درێژ دەکرد و ١٠٠ جار لەسەر دەست خۆی بەرز و نزم دەکردەوە،
٢٠٠ جار دادەنیشت و هەڵدەستایەوە و ٥٠ جاریش مەشقی ئەژنۆچەماندنەوەی دەکرد.

بەندییەکان و خێزانەکانیان کۆمەکیان لە خاچی سووری نێونەتەوەییەوە
پێ دەگەیشت. ئەگەرچی لە هەمووی گرنگتر پێوەندیی ناوخۆی بەندییەکان بوو.
دەستیان پێ کرد لە بەندیخانەدا بخوێنن.
کتێبیان وەردەگرت و خولی خوێندنیان بە نهێنی ڕێك دەخست.
لە جەژنی لەدایکبوونی مەسیحدا کۆنسێرتیان پێشکەش دەکرد و پێشبڕکێیان دادەهێنا.
شانۆیان وازی دەکرد، هەم شەکسپیر و هەم درامای یۆنانی.

# کانەبەرد

بەیانییەکی زستان بەندییەکانیان کردە دەرەوە بەرەو کانەگەچێك لەناو دورگەکەدا.
دەبوو لەوێ بەردەگەچ لە چیاکە بکەنەوە.
ئەمە کارێك بوو لە بەردشکاندن زۆر زەحمەتتر بوو.
بەندییەکان دەبوو خێرا کار بکەن و ڕێیان نەدەدان
قسە بکەن، گۆرانی بچڕن یا فیکە بکێشن.
پاسەوانەکان لەسەر سەکۆی بەرز ڕادەوەستان و
بە چەکی ئۆتۆماتیکەوە چاودێرییان دەکردن.

کانەگەچەکە بە زستان سارد و شێدار بوو
بە هاوینانیش خۆر بێرەحمانە پیاوی دەسووتاند.
کە ئێواران بەندییەکان دەگەڕانەوە بۆ ژوورەکانیان
سەرتاپییان بە تۆزی گەچەکە سپی دەبوو، دەتگوت خێون.
ئەوەندە بێهێز و ماندوو دەبوون هەموو لەشیان لەبەر ئێش دەیزیڕاند.
بەڵام ئەوەی لە گەرماوسەرما و تۆز خراپتر بوو،
ئەو رووناکییە زۆرە بوو لە کانەکەدا.
بەردەگەچە سپییەکە تیشکی خۆرەکەی بەهێزتر دەکرد و
ئەمە دەبووە هۆی ئەوەی بەندییەکان چاویان
بئێشێت و ئاو بکات.

بورجی چاودێری لە دورگەی ڕۆببین



بەندییەکان زۆرجار لە لایەن پاسەوانەکانەوە بە خراپی دەعاملێنران،
بەڵام بەندییەکانی ANC هەوڵیان دەدا پاسەوانەکانی خۆیان بناسن.
زۆریان کورەجووتیاری هەژار بوون.
پاسەوانی وا هەبوو بەحاڵ دەیتوانی بخوێنێتەوە،
هەموویان دڵڕەق نەبوون، هەندێکیان لەگەڵ بەندییەکاندا بوون بە دۆست.

هەندێ جار بەندییەکان پارەیان دەدایە پاسەوانەکان
بۆ ئەوەی تۆزێ خواردنی زیاتر، سێوێك یا هەندێ جگەرەیان دەست بکەوێت.
هەندێ جاریش پارەیەکی زۆریان دەدا بۆ ئەوەی
بە نهێنی ڕۆژنامەیەکیان دەست بکەوێت.
بەندییە سیاسییەکان دەیانتوانی دەستبەرداری
خۆراك و تووتن ببن
تەنیا بیانتوانیایە شتێك بخوێننەوە و بزانن لە وڵاتدا چی ڕوو دەدات.
پاسەوانەکان لای کانە بەردەکە
بابۆڵەی خۆیانیان پێ بوو کە بە کاغەزی ڕۆژنامە دەیانپێچایەوە
کە بابۆڵەکانیان دەخوارد کاغەزەکانیان فڕێ دەدایە
ناو زبڵ و پیسییەکانەوە.
ئەودەم بەندییەکان ئەم کاغەزە پیسانەیان دەردەهێنا و
لەژێر کراسەکانیانەوە دەیانشاردنەوە.

ئەگەر ئاشکرا ببووایە ڕۆژنامەیان پێیە تاوانێکی جیددی بوو.
بەوە سزا دەدران چەند ڕۆژێك بخرێنە ژووری تەریککردنەوە.
لەبەر ئەوە تەنیا بەندییەکی هەڵبژێردراو
دەنگوباسەکانی دەخوێندەوە و وتارە گرنگەکانی دەبڕی.
پاشان وتارەکانی بەسەر بەندییەکانی تردا دابەش دەکرد.
ئەرکی ئەمانە ئەوە بوو دەنگوباسەکان کورت بکەنەوە و
لەسەر پارچەکاغەزی بچووك بیاننووسنەوە.

لەبەر ئەوە بەندییەکان وتاری ڕۆژنامەکانیان دەدڕی و
دەیانخستنە ناو سەتڵە توالێتەکانەوە.
ئەوە جێگەیەکی چاك بوو بۆ شاردنەوە، چونکە
کەس نەیدەویست ئەوێ بپشکنێت.
کاغەزە بچووکەکانی دەنگوباس بە دزییەوە
بە هەموو بەندیخانەدا دەسووڕانەوە.

نێلسۆن ماندێلا و والتەر سیسولو لە حەوشەی بەندیخانەکەدا



# بەندیخانە دەبێتە خوێندنگەیەك

ڕۆژ و حەفتە و مانگ و ساڵ بە سەر چوون.
هەموو دەقیقەیەك بەندییەكان تاسەی ئازادییان دەكرد.
هەندێ جار لەسەر كەنارەكانی دوورگەكە كاریان دەكرد، گیای
زەریایان كۆ دەكردەوە و چاویان بە كەشتی دەكەوت بە لایاندا دەڕۆیشت.
ئەوان هەمووی یانزدە كیلۆمەتر لە سەرزەویی وڵاتەكەوە دوور بوون،
بەڵام هەرگیز نەیاندەتوانی بچنە ئەوێ.
ئەوان حوكم درابوون لە دوورگەی ڕۆببین بمرن.

بۆ ئەوەی ورە لەدەست نەدەن دیسانیش بەردەوام كاریان دەكرد.
لە خواردن مانیان دەگرت، پرۆتێستیان دەكرد و لەسەرخۆ وەزعیان باشتر دەبوو.
پانتۆڵی درێژیان دانێ و خواردنی باشتریان پێ دان.
ڕێگەیان پێ دان لە ڕۆژانی پشوودا یاریی كارت و نەردێن بكەن.
پاسەوانەكان ئیتر گوێیان بەوە نەدەدا ئەگەر لە كاتی كاركردندا
لەناو خۆیاندا قسەیان بكردایە.

جاروبار بەندییەكان بە كۆمەڵی جیاجیا دادەنیشتن و بە درێژاییی
ڕۆژەكە خەریكی گوتوبێژ دەبوون.
بەندیخانەكە خەریك بوو دەبوو بە خوێندنگەیەكی گەورە.
زۆر لە بەندییەكان كۆرسی زانستگەیان دەخوێند.
نێڵسۆن ماندێلایش لەسەر خوێندن بەردەوام بوو.
هاوكاتیش لە ژوورەكەی خۆیدا نووسینگەیەكی پارێزەریی هەبوو،
خولی پێگەیاندنیشی لەبارەی سیاسەت و ئابوورییەوە
بۆ بەندییەكانی دیكە ڕێك دەخست.
بەندیی دیكە دەرسی بابەتی دیكەیان دەگوتەوە.
والتەر سیسولو مێژووی ANCی پێ دەگوتنەوە و
بەندییەكی هندی باسی گاندی و
خەباتی ئازادیخوازانەی هندستانی دەگێڕایەوە.

بەندییە سیاسییەكان بە هەموو شێوەیەك هەوڵیان
دەدا هاوكاریی یەكتر بكەن.
پەیامی نهێنییان لەناو پاكەتی شخاتەدا، كە ناوەكەیان دەرهێنابوو، بۆ یەكدی دەنارد.
نامەیان لەسەر كاغەزی توالێت بە حەرفی یەكجار ورد دەنووسی.



پۆلیس هێکتۆر پیتەرسۆنی **١٣** ساڵەیان لە سۆوێتۆ لە ڕۆژی **١٦**ی حوزەیرانی **١٩٧٦**دا کوشت.
لە ڕێپێوانێکدا بەشداریی کردبوو دژی خوێندن بە زمانی ئەفریکان، کە منداڵان تێی نەدەگەیشتن.

نێڵسۆن ماندێلا لە بەندیخانەدا ڕێبەرێکی سیاسی بوو،
بووبووە نموونەی باڵا بۆ زۆر لە بەندییەکان.

ساڵ بە ساڵ بەندیی تازە دەهاتن بۆ دوورگەی ڕۆببین.
ئەمانە گەنجانی تووڕە بوون کە بەزۆری ڕەخنەیان لە ANC دەگرت و
پێیان وا بوو نێڵسۆن ماندێلا کەسێکی کۆنەباوە.
ئەمانە ئەشکەنجە درابوون و ڕقیان لە مرۆڤی سپی بوو.
ڕقیان لە پۆلیس بوو و ئامادە نەبوون گوێڕایەڵی فەرمانەکان بن.
ڕقیان لە زمانی ئەفریکان بوو، زمانی
چەوسێنەرە سپییەکان.

نێڵسۆن زۆرجار ویژدانی ئازاری دەدا
چونکە نەیدەتوانی یارمەتیی ماڵ و منداڵەکەی خۆی بدات.
دایکی لەو ترانسکێیە دوورەوە هاتە سەردانی.
نێڵسۆن هەستی کرد پیر و لاواز بووە.
هەر دوای ئەو سەردانە زۆری پێ نەچوو دایکی بە دڵەوەستان مرد.
نێڵسۆن منداڵی هەرە گەورە و تاکە کوڕی بوو.
بەپێی نەریتی گەلەکەی دەبوو دایکی بە خێو بکات.
ئێستا نەیدەتوانی تەنانەت بچێت بۆ ناشتنەکەی.

ساڵێك دواتر تێمبی، کوڕە گەورەکەی،
بە ڕووداوێکی ئۆتۆمۆبیل مرد.
ئەم بێدەستەڵاتییە نێڵسۆنی ئازار دەدا.
لە دڵی خۆیدا بیری دەکردەوە:
– من وازم لە خێزانەکەم هێناوە. ئایا خەبات ئەوەی دەهێنا؟

دایکی نێڵسۆن ماندێلا لەگەڵ وێنەیەکی کوڕەکەیدا







ژوورەکەی نێلسۆن ماندێلا لە زیندانی دورگەی ڕۆبین

کاتێ کچە بچکۆلەکانی دەهاتن بۆ سەردانی
بە زەحمەت باوکی خۆیان دەناسییەوە.
لە هەموو ئەو وێنانەدا کە لای ئەوان هەبوون گەنج بوو.

نێلسۆنیش لە ژوورەکەدا وێنەی خێزانەکەی لا هەبوو.
ساڵان بە سەر چوون. منداڵەکانی شوویان کرد و ژنیان هێنا و منداڵیان بوو،
وێنەکانیش هەر زۆرتر و زۆرتر دەبوون.
نێلسۆن ئێستا ئیتر پیاوێکی گەنج نەبوو، باپیرە بوو.
هەموو بەیانییەك لەسەرخۆ تۆزی سەر وێنەکانی دەتەکاند.
لە دوای هەموویان وێنەی وینیی پاك دەکردەوە.
جارێکیان ئاوای بۆ نووسیبوو:
"ئەگەر سەردانەکانی تۆ، نامە جوانەکانی تۆ و
خۆشەویستیی تۆ نەبووایە، ساڵانێك بوو من ڕووخابووم."

لە بەهاری ١٩٨٢دا شەوێکیان لەپڕ ماندێلا و
سێ بەندیی دیکە گوێزرانەوە بۆ زیندانێکی تر.
دوای نزیکەی بیست ساڵ دورگەی ڕۆببینیان بە جێ هێشت.
بەندیخانە تازەکە لەناو وڵاتەکەدا بوو، ناوی پۆڵسموور بوو.

بەندییەکانی ANC نهۆمێکی تایبەتیان وەرگرت کە باڵکۆنی هەبوو و پێویست نەبوو کار بکەن.
نێڵسۆن ماندێلا لەسەر سەربانی بەندیخانەکە باخچەیەکی دامەزراند.
تەنەکەی گەورە گەورەی دەهێنا و لە ناوەڕاستدا دەیبڕینەوە و
بەو جۆرە ٣٢ گوڵدانی هاوشێوەی دەست کەوت.
هەموو بەیانییەك شەپقەیەکی پووشی لەسەر دەکرد و
دەستکێشی کارکردنی دەکردە دەست و زۆری پێ نەچوو
بوو بە خاوەنی ٩٠٠ ڕووەك کە دەبوو خزمەتیان بکات.
پێی وا بوو ژیانێکی بەڕاستی نایاب و پڕ ناز و نیعمەت دەژی.

کە وینني دەهاتە سەردانی جلی جوان و ڕازاوەی لە بەر دەکرد.
لە یەکێ لەو سەردانانەدا شتێکی نائاسایی ڕووی دا.
نێڵسۆن و ئەو بێ ئەوەی دیوارێك لە یەکیان جیا بکاتەوە، چاویان بە یەکتر کەوت.
دەیانتوانی دەست لە یەکدی بدەن، باوەش بە یەکدا بکەن و یەکتری ماچ بکەن.
نێڵسۆن هەزار خەونی بەمەوە بینیبوو!
خۆی و وینني بێدەنگ ڕاوەستابوون و یەکتریان لە باوەش گرتبوو.
تاکە شتێ کە دەبیسترا دەنگی لێدانی دڵیان بوو.
بیستویەك ساڵی تەواو بوو دەستیان بەر یەك نەکەوتبوو.



ڕەفی کتێبەکانی نێڵسۆن
لە ژووری زیندانەکەیدا،
وێنەیەکی وینني داناوە



ناشتنی حەوت ئەندامی ANC

## توندوتیژی بەردەوام دەبێت

لە دەرەوەی دیوارەکانی بەندیخانە توندوتیژی بەردەوام بوو.
"نێزەی نەتەوە" بۆمبی دەتەقاندەوە و
حوکوومەتیش هێرشی دەکردە سەر نووسینگەکانی ANC لە گەلێ وڵات.
خەڵکی دەدرانە بەر قامچی، دەسووتێنران و بە گوللە دەکوژران.
گەلێ کەس پەنایان بردە بەر کڵێساکان و
هەندێ لە پەرستگاکان بوون بە ئۆردوگای پەنابەران.

بیشۆپ دێسمۆند تووتوو جارێکیان وتی:
– ئەوان گەلەکەمان وا دەکوژن، وەك چۆن مرۆڤ مێش دەکوژێت!

تابووتی مردووەکان بە ئالآی قەدەغەکراوی ANC دادەپۆشران.
هاوکاتیش نارەزایی لە ئەفریقای باشوور و لە هەموو دنیادا زیادی دەکرد.
هەندێ ولآت بۆیکۆتی خستە سەر کالآی ئەفریقای باشوور.
وەرزشکاران لەگەڵ ئەوانەی ئەفریقای باشووردا پێشبڕکێیان نەدەکرد.
مۆسیقاژەنەکان ئیتر لە ئەفریقای باشوور هیچیان پێشکەش نەدەکرد.

خەڵکی هەرچی زۆرتر داوایان دەکرد:
– نێڵسۆن ماندێلا دەبێ ئازاد بکرێ!
دەبێ ڕێگەی کارکردن بە ANC بدرێ و هەموو بەندییە
سیاسییەکان بەر بدرێن.



گەورەبێشۆپ دێزمۆند تووتوو

ساڵی **١٩٨٥** سەرکۆماری ئەفریقای باشوور پێشنیازێکی پێشکەش کرد:
نێڵسۆن ماندێلا ئازاد دەکرێ
ئەگەر واز لە خەباتی چەکدار بهێنێت.

پێشنیازەکە لە ڕادیۆوە خوێنرایەوە.
کە نێڵسۆن ماندێلا پێشنیازەکەی گوێ لێ بوو،
هەر زوو پێوەندیی کرد بە سەرۆکی بەندیخانەکەوە،
داوای لێ کرد ڕێی بدەن چاوی بە ژنەکەی و پارێزەرەکەی بکەوێت.

حەفتەیەك دواتر ویننی و پارێزەرەکە هاتن بۆ بەندیخانە.
نێڵسۆن وەرامێکی نووسراوی دانێ بۆ سەرکۆمار.
نەیدەویست بەر بدرێ،
ئەگەر حوکوومەت واز لە توندوتیژییەکەی نەهێنێت.
سێ ڕۆژ دواتر زیندزیی کچی
لە بەردەم خەڵکێکی زۆردا کە هاواریان دەکرد،
لە ستادیۆمی وەرزشی سۆوێتۆ، وەرامەکەی خوێندەوە:
″من سەرم سووڕ دەمێنێت لەوەی حوکوومەت
دەیەوێ ناچارم بکات بیکەم.
من کەسێکی توندوتیژئامێز نیم.
ئێمە ئەو کاتە دەستمان کردە خەباتی چەکدارانە،
کە ئیتر ئیمکانی هیچ بەرهەڵستییەکی دیکە نەما.
لەوساوە کە من خراومەتە زیندانەوە خەڵکێکی زۆر کوژراون.
منیش ئەوەندەی ئێوە ژیانم خۆش دەوێ،
بەڵام من نامەوێ مافە مرۆڤانەکانی خۆم بفرۆشم،
بۆ ئەوەی ئازاد بکرێم.
من ئامادە نیم مافەکانی خەڵکیش بفرۆشم.
ئازادیی ئێوە و ئازادیی من بە یەکەوە گرێ دراون. من دەگەڕێمەوە.″



زیندزی، کچە هەرەبچکۆلەکەی نێڵسۆن ماندێلا لە یاریگەی سۆوێتۆ.

## گوتوبێژی نهێنی

نیوساڵ لەوەوپاش نێڵسۆن ماندێلا لەپڕ گوێزرایەوە
بۆ بەشێکی دیکەی بەندیخانەکە و
بە تەواوی لە هەڤاڵانی و لە باخچەی باڵکۆنە هەتاوگیرەکەی جیا کرایەوە.
بەڵام بڕیاری دا ئەمە وەك سزایەك تەماشا نەکات.
لە تەنیاییی تازەیدا کاتی دەبوو بیر بکاتەوە.

ئێستا ئیدی دڵنیا نەبوو کە "نێزەی نەتەوە" بتوانێت
بەسەر عەسکەر و پۆلیسی حوکوومەتدا سەر بکەوێت.
تا ئەو کاتە گەلێ کەس لە هەردوو لا کوژرابوون.
ئەو پێی وا بوو، ئەو دوو دوژمنە دەبێ دەست بە گوتوبێژ بکەن.
نامەیەکی بۆ وەزیری داد نووسی و
پێشنیازی ئەوەی کرد چاویان بە یەك بکەوێ.

یەکەمین کۆبوونەوە سێ سەعاتی خایاند.
پاشان تا چەند مانگێکیش هیچ ڕووی نەدا،
بەڵام نێڵسۆن ماندێلا تێگەیشت کە شتێك خەریکە دەگۆڕێ.
بەیانییەك یەکێك لە سەرۆکەکانی بەندیخانەکە هات بۆ ژوورەکەی و پێی وت:
– ماندێلا، دەتانەوێ لەگەڵم بێن و تەماشایەکی شار بکەن؟

نێڵسۆن بە سەرسووڕمانەوە وتی بەڵێ.
بە ماشێنی سەرۆکی بەندیخانەکە بەناو کەیپتاوندا سووڕانەوە.
نێڵسۆن بە کونجکاوییەوە تەماشای ئەو خەڵکەی دەکرد چۆن دیار بوون.
وای هەست دەکرد گەشتیارێکە لە وڵاتێکی بێگانەدا.
ئەو کاتە ٢٤ ساڵ بوو لە زینداندا بوو.
دوای چەند مانگێك وەزیری داد ڕایگەیاند
کە حوکوومەت گرۆیەکی گوتوبێژی دەوێ.

نێڵسۆن ماندێلا لەگەڵ دوژمندا دەستی بە باسوخواس کرد.
تاقمی حوکوومەت لە چوار کەس پێك هاتبوو.
لەلایەن ANCیەوە نێڵسۆن ماندێلا تەنیا خۆی بوو.

ڕۆژێکیان، وەك کردبوویان بە خوو، لەپڕ نێڵسۆن ماندێلایان
سوار کرد و بردیان بۆ بەندیخانەیەکی تازە،
بەندیخانەی ڤیکتۆر ڤێرستەر جێگەیەکی زۆر جوانی هەبوو،
لە ناوچەیەکدا کە ڕەزیان تێدا بە خێو دەکرد.
ماندێلا لێرە خانوویەکی خۆی هەبوو بە باخچە و
هەستێڵی مەلەکردنەوە.
دەیتوانی پێشوازیی میوان بکات، چ تاقمەکەی حوکوومەت بێ،
خێزانی خۆی یا هەڤاڵانی.
چێشتلێنەرێکی تایبەتیان دابوویێ، کە خواردنی خۆشی لێ دەنا.
وەك زیندانییەك دەژیا لە قەفەسێکی زێڕیندا.

کە تەمەنی گەیشتە ٧١ ساڵ نزیکەی هەموو خێزانەکەی هاتنە سەردانی.
چێشلێنەرەکە ژەمەخواردنێکی جەژناسای لێ نا و
نێڵسۆن هەستی بە خۆشی و بە خەفەتیش دەکرد.
بیری لە هەموو ئەو شتانە دەکردەوە کە لە ماوەی
ساڵانی تەنیاییی زینداندا لە دەستی چووبوون.



نێڵسۆن ماندێلا لەگەڵ
بامباتای نەوەیدا.



## یانە خەتەرناکەکەی وینی

لە هەموو ساڵانی بەندبوونی نێڵسۆندا، وینی ماندێلا ڕاو نرابوو.
خرابووە زیندانەوە و بە تەواوی قەدەغە کرابوو.
جارێکیان دووسەد ڕۆژ لە ژوورێکی تاکەکەسیدا بەند بوو،
بێ ئەوەی بتوانێ خۆی بشۆرێت، یا ئاوێ بکا بە خۆیدا.
کاتێ کە ئازاد کرا، دوای ئەوەی ساڵێك زیاتر
لە بەشی ئیزۆلەکراودا بوو، گۆڕابوو.
ئێستا ئیتر ئەو وینییە دڵخۆش و گەرمەی جاران نەبوو.

نێڵسۆن نیگەران بوو بۆی.
وینی بە شێوەیەکی شەڕانی هەڵسوکەوتی دەکرد و پێی وا بوو
توندوتیژی پێویستە.
تاقمێ کوڕ کە ناوی خۆیان نابوو یانەی یەکگرتووی ماندێلا بۆ فووتبۆڵ
لە حەوشەی ماڵەکەیدا دەژیان.
ئەم کوڕانە بە دەگمەن یاریی فووتبۆڵیان دەکرد.
وینی دەیگوت ئەمانە ژیانپارێز (پاسەوان)ی ئەون.
بەڵام یانەکە تاقمێکی چەکدار بوون و ترسیان
لە سۆوێتۆدا بڵاو دەکردەوە.
کوڕەکان بەوە تاوانبار کران کە کوڕێکی ١٤ ساڵانیان
کوشتووە: ستۆمپی سایپای.
ڕاهێنەری یانەکە بە تاوانی ئەو کوشتنە حوکم درا.
ئەو وتی وینی پێی وتووە ئەو کوڕە بکوژێ.
ئەندامێکی دیکەی یانەکە وتی خۆی بینیویەتی
وینی دوو جار بە چەقۆ داویەتی لە ستۆمپی سایپای.

نێڵسۆن ماندێلا تۆقی.
دەیویست باوەڕ بکات کە وینی بێگوناهە.
نەیدەتوانی ورە و پشتگیریی ئەوی لە بیر بچێتەوە،
لە ماوەی ئەو هەموو ساڵانەدا کە خۆی و هەڤاڵەکانی لە زیندانادا بوون.




منداڵانی سۆویتۆ چاوەڕوانی گەڕانەوەی ماندێلان

لە تشرینی یەکەم (ئۆکتۆبەر)ی ١٩٨٩دا والتەر سیسولو و
حەوت ڕێبەری دیکەی ANC بەر دران.
نێڵسۆن تێگەیشت کە زۆری پێ ناچێ نۆرەی ئەویش دێت ئازاد ببێت.

ڕۆژی دووەمی شوباتی ١٩٩٠
دی کلێرك، سەرکۆماری باشووری ئەفریقا،
ئاخاوتنێکی بەهێزی پێشکەش کرد، وتی دەبێ ڕێگەی کارکردن
بدرێ بە ANC، PAC، پارتیی کۆمونیست و ٣١ ڕێکخراوی دیکەی سیاسی.
هەموو ئەو بەندییە سیاسییانەی کە تاوانی توندوتیژییان نەکردووە بەر بدرێن.
هەموو لەسێدارەدانێك هەڵبوەشێنرێتەوە.

ئەفریقای باشوور لە شەوورۆژێکدا گۆڕا،
ئاڵای ANC لە هەوادا دەشەکایەوە،
وشەکانی نێڵسۆن ماندێلا چیی دیکە قەدەغە نەبوون.
ڕۆژنامەکان لەسەریان دەنووسی و وێنەی گەورەی ئەویان بڵاو دەکردەوە.
ANC سەر کەوتبوو!



نێڵسۆن و ویننی ماندێلا لە دەرگاکانی زیندانەوە دەچنە دەرەوە، ١١ی شوباتی ١٩٩٠.

## ئازاد

دوای حەفتەیەك نێڵسۆن ماندێلا برا بۆ نووسینگەی سەرکۆمار.
سەرۆك دی کلێرك بە بزەیەکی دۆستانەوە
ڕایگەیاند کە هەر لە سبەینێوە ماندێلا پیاوێکی ئازادە.

نێڵسۆن ماندێلا پێی سەیر بوو، دوودڵ بوو.
بۆچی دەبێ هەموو ئاوا لەپڕ و بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو ڕوو بدات؟
سوپاسی سەرکۆماری کرد و وتی
دەمەوێ حەفتەیەکی تریش لە زینداندا بمێنمەوە.
دەیویست نەخشەیەك بۆ ئازادبوون و دەرچوونەکەی دابنێت.
وتی: ئەوە بیستوحەت ساڵە من چاوەڕوانی ئازادیم،
ئێستا دەمەوێ حەوت ڕۆژی دیکەیش چاوەڕێ بم.
سەرۆك دی کلێرك لەگەڵ ئەمە نەبوو، وتی
پێشەکی هەموو شتێك ڕێك خراوە.
ڕۆژی دواتر ماندێلا بە فڕۆکە دەبرێ بۆ جۆهاننەسبورگ.
لەوێ بە بەرچاوی ڕۆژنامە و تەلەڤیزیۆنەکانی هەموو دنیاوە
ئازاد دەکرێ.

نێڵسۆن ماندێلا وەرامی دایەوە: بە هیچ جۆرێك وەهام ناوێ!
دەیویست بە پیاسە لە دەروازەی بەندیخانەکەیەوە بێتە دەرەوە و
دەیویست سوپاسی ئەو کەسانە بکات لەوێ خزمەتیان کردووە.
دوایی دەیویست لە کەیپتاون خەڵك ببینێت و
وتی: کە ئازاد بم، دەمەوێ خۆم کاروباری خۆم ڕێك بخەم!

سەرۆك دی کلێرك دەبوو نووسینگەکەی بە جێ بهێڵێ
بۆ ئەوەی لەگەڵ حوکوومەتدا هاوپرسەکی بکات.
لە دواییدا چارەیەکیان دۆزییەوە کە هەردوو لا بە دڵیان بوو.
ماندێلا دەیتوانی بە پیاسە لە دەروازەی بەندیخانەکەوە بچێتە دەرێ،
بەڵام دەبوو سبەینێ ئازاد بکرێ.

کە گەڕایەوە بۆ بەندیخانەکەی نیوەشەو بوو.
ئەگەرچی درەنگ بوو، دەبوو لەگەڵ ویننی و لەگەڵ
هەڤالانی سیاسیی خۆیدا قسە بکات.
دەبوو وتارێك بنووسێت.
تەنیا دوو سەعاتی بە دەستەوە بوو بۆ خەوتن.

بۆ بەیانییەکەی وینن و هەندێ لە دۆستان هاتن بۆ ماڵەزیندانەکە.
نێڵسۆن چێشلێنەرەکە و پاسەوانەکانی لە ئامێز گرتن.
ئەوجا دەست لەناو دەستی وینیدا
لە دەروازەی بەندیخانەکەوە چووە دەرەوە.

ئێستا ئەو ئازاد بوو. دەهەزار ڕۆژی بەندیخانەکەی بە سەر چووبوو.
وینی و نێڵسۆن بە ماشێن بران بۆ کەیپتاون.
نێڵسۆن دەبوو لەوێ، لە مەیدانەکەی بەردەم تەلاری شارەوانیدا
ئاخاوتنەکەی خۆی پێشکەش بکات.
کە ئۆتۆمۆبیلەکە لە مەیدانەکە نزیك بووەوە
لە لایەن ئاپۆرەی خەڵکەوە ڕاوەستێنرا.
خەڵکی دڵخۆش چوونە سەربانی ماشێنەکە و چوونە سەر سنووقی مۆتۆڕەکە.
ماشێنەکەیان دەهەژاند و لە جامەکانیان دەدا.
لەناو ئۆتۆمۆبیلەکەدا وا هەست دەکرا تاوە تەرزەیەکی بەهێز دایکردووە.
ئۆتۆمۆبیلەکە نەیدەتوانی یەك سەنتیمەتر بجووڵێت.
شۆفێرەکە لە ترسان هەترەشی چووبوو،
ماندێلایش دەیگوت تۆ بڵێی ئاپۆرەی خەڵك بە خۆشەویستی بیکوژن.




که لە دواییدا ماشێنەکە گەیشتە مەیدانەکە
چلهەزار مرۆڤ چاوەڕوان بوون.
نێڵسۆن ماندێلا مشتی بەرز کردەوە و هاواری کرد:
– ئاماندلا! دەستەڵات! ئازادی!

هەستی دەکرد جارێکی دیکە گەنج بووەتەوە.
سوپاسی خێزانەکەی کرد و
قسەی بۆ خەڵکی ئەفریقای باشوور و بۆ جیهان کرد، وتی:



– بە سایەی ورەی ئێوە و قوربانیدانی ئێوەوەیە من ئەمڕۆ
لێرەدا ڕاوەستاوم. ئەو ساڵانەی ژیانم کە ماون، دەمەوێ
بۆ ئازادیی ئێوەیان تەرخان بکەم.

چەند ڕۆژێك دواتر نێڵسۆن و ویننی چوون بۆ جۆهاننەسبورگ.
لە ماڵە بچکۆلەکەی خۆیاندا، لە ئۆرلاندۆ وێست ٨١١٥، نووستن.
تەنیا ئەو کاتە بوو کە نێڵسۆن ماندێلا هەستی کرد بە ڕاستی ئازادە.
کە خرایە زیندانەوە تەمەنی ٤٤ ساڵ بوو، ئێستا تەمەنی ٧١ ساڵ بوو.
تاسەی ئەوەی دەکرد ژیانێکی ئاسایی بژی.
دەیویست لەگەڵ کوڕەزا و کچەزاکانیدا یاری بکات.
دەیویست بە هێمنی سەر لە گۆڕەکەی دایکی بدات.

بەڵام تووشی کۆمەڵێ کێشەی تازە بوو، دەبوو
ڕووبەڕوویان ببێتەوە.
ویننی درایە دادگا.
بە تاوانی ڕفاندن و هاوتاوانیی ئازاردان حوکم درا.
نێڵسۆن پێی وا بوو بێگوناهە،
بەڵام دیسانیش خۆی و ویننی بڕیاریان دا لە یەکدی جیا ببنەوە.

نێڵسۆن وتی:
– خۆشەویستیم بۆ ویننی جاران چەند گەورە بووە،
ئێستایش هەر وایە.
من دڵنیام ئەو کاتەی من لە زینداندا بووم، ژیانی ئەو لە ژیانی من
سەختتر بوو.
هەروەهایش دڵنیام کە گەڕانەوەی من بۆ ئەو زەحمەتتر بوو تا بۆ من.
لەوانەیە بۆ خەباتکاری ئازادی نەگونجاو بێت ماڵ و خێزانی هەبێت.

منداڵەکانی لێی بێهومێد بوون، وتیان:
– ئێمە وامان دەزانی باوکێکمان هەیە و ڕۆژێ لە ڕۆژان دەگەڕێتەوە،
بەڵام کاتێ گەڕایەوە، جارێکی تر بە تەنیا بە جێی هێشتین.
ئەو ئێستاکە بووبوو بە باوکی هەموو ئەفریقای باشوور.



# توندوتیژی و گوتوبێژ

ژیانی نێڵسۆن ماندێلا پڕ بوو لە سەفەر و کۆبوونەوەی زۆروزەبەند.
ANC و حوکوومەت ئاگربەستێکیان دەست پێ کردبوو.
بەڵام توندوتیژی لە ئەفریقای باشوور دیسان هەر بەردەوام بوو.
پارتیی جۆراوجۆری سیاسی و گرۆی جیاوازی گەلان دژی یەکدی شەڕیان دەکرد.
پارتیی ئینکاتا دژی ANC شەڕی دەکرد.
خەڵك دەکوژران و پۆلیسیش تەماشای دەکرد،
بێ ئەوەی توندوتیژی ڕابوەستێنێت.
کۆنفرانسی ئەفریقای باشوورێکی دێمۆکرات دامەزرێنرا و
حوکوومەت و ANC و پارتییە سیاسییەکانی دیکە بەشدارییان تێدا کرد.

گەلێ مەسەلەی سەخت دەبوو چارەسەر بکرێن و
دەبوو قانوونی تازە بنووسرێن و دەبوو توندوتیژی ببرێتەوە.
هەموو گەورەسالان دەبوو مافی دەنگدان وەربگرن.

ئەم باسوخواسانە کاتیان دەویست.
سالێك تێپەڕی و پێ نەدەچوو هیچ شتێك چاکتر بووبێت.
ئەوە ئاشکرا کرا کە پارتیی ئینکاتا پارەی لە پۆلیس وەرگرتبوو
بۆ ئەوەی ئەندامانی ANC بکوژێت.
حوکوومەت بەمەی دەزانی بەڵام ڕێگەی دابوو کوشتن بەردەوام بێت.

هەرچی زیاتر خەڵکی ئەفریقای باشوور داوایان دەکرد:
ماندێلا! بەسە، واز لە قسەکردن بهێنە!
خەریك بوون تەحەمولیان لە دەست دەدا.
دەستیان پێ کرد لەسەر پلاکات و تابلۆکانی ڕاگەیاندن بنووسن:
ماندێلا! چەکمان بدەرێ!

بەڵام نێڵسۆن ماندێلا نەیدەویست بگەڕێتەوە سەر توندوتیژی و شەڕ.
لەجێی ئەوە ANC پێشنیازی کرد گەل مان بگرێت.
ڕۆژانی سێیەم و چوارەمی ئاب (ئاوگوست)ی ۱۹۹۲
لە چوار میلیۆن زیاتر خەڵك لە ماڵدا دانیشتن و نەچوونە سەر کار.
ئەمە گەورەترین مانگرتنی سیاسی بوو لە مێژووی ئەفریقای باشووردا.
گوتوبێژی ANC و حوکوومەت بەردەوام بوو.

ساڵی ۱۹۹۳ نێڵسۆن ماندێلا و سەرکۆمار دی کلێرك
خەڵاتی ئاشتیی نوبێلیان لە ئۆسلو وەرگرت.
زۆر کەس ئەو پرسیارەیان دەکرد کە نێڵسۆن ماندێلا چۆن توانیی
خەڵاتی ئاشتی بە هاوبەشی لەگەڵ دوژمنێکدا وەربگرێت.
ئەو لە وەرامدا گوتی کاتێ مرۆڤ لەگەڵ دوژمندا ڕێك دەکەوێ
مرۆڤ ناچارە، دەبێ پێکەوە کار بکات، ئەودەمیش مرۆڤ دەبێ پێکەوە قسە بکات.



نێڵسۆن ماندێلا و سەرۆك دی
کلێرك خەڵاتی نۆبێلی ئاشتییان
پێ بەخشرا، ساڵی ۱۹۹۳.



یەکەمین هەڵبژاردنی دیمۆکراتیکی ئەفریقای باشوور، ١٩٩٤



# یەکەمین هەڵبژاردنی دیموکراتیك

ڕۆژی ٢٧ی نیسان (ئەپریل)ی ١٩٩٤ نێلسۆن ماندێلا
بۆ یەکەمین جار لە ژیانی خۆیدا دەنگی دا،
تەمەنی ٧٦ ساڵ بوو.

ڕۆژانی هەڵبژاردن ڕۆژانی ئاهەنگ بوون لە هەموو ئەفریقای باشووردا.
خەڵك لە ڕیزی دوورودرێژ و پێچاوپێچدا ڕاوەستان و
بە سەعاتان چاوەڕوان بوون تا بتوانن دەنگی خۆیان بخەنە
ناو سندووقێکی سادەی دارینەوە.
سپی و ڕەش، پیر و جوان، هەموو خۆیان ترنجاندبووە ڕیزێکەوە.
خاوەنزەوی و پاڵە پێکەوە ڕیزیان گرتبوو،
هەژاران لەگەڵ زەنگینەکاندا لە ڕیزێکدا بوون.
هەموو دەنگەکان نرخی وەکیەکیان هەبوو.

CNA لە سەددا ٦٢ی دەنگەکانی لە هەموو وڵاتدا وەرگرت.
لە ماوەی سێسەد ساڵدا سپییەکان حوکمی ئەفریقای باشووریان کردبوو،
ئێستا دانیشتووانی ڕەش دەستەڵاتیان دەست کەوتبوو.
زۆر لە سپی و ڕەنگدار و هندییەکان دەترسان.
بڵێی ڕەشەکان تۆڵە بکەنەوە؟

نێلسۆن ماندێلا ئەرکێکی تازەی کەوتە ئەستۆ؛
دەبوو یارمەتیی ئەوە بدات وڵاتەکە یەك بخات. ئەو وتی:
– وڵاتەکەی ئێمە وەك پەلکەزێڕینەیەکە،
گەلی ئێمە زۆر ڕەنگی هەیە.
ئێستا دەبێ هەموو خەڵکی ئەفریقای باشوور دەستی یەکتر بگرن.
نابێ ئەوەی ڕووی دا لە بیرمان بچێتەوە، بەلام دەبێ ببوورین.

# نێڵسۆن ماندێلا دەبێتە سەرکۆمار

یەك مانگ دواتر نێڵسۆن ماندێلا بوو بە یەکەمین
سەرکۆماری بە دیمۆکراتی هەڵبژێردراوی ئەفریقای باشوور.
چوار ساڵ لەوەوپێش بوو لە بەندیخانە بەر درا.
ئەژنۆیەکی ژانی دەکرد، چونکە لە دورگەی ڕۆببین ئازاری پێ گەیشتبوو،
چاوەکانیشی بە هۆی ١٣ ساڵ کاردکردنەوە لە کانەبەردا
خراپ بووبوون.
بەڵام پشوودانی نەبوو.
زۆرجار سەعات چوارونیوی بەیانی لە خەو هەڵدەستا،
نوێنەکەی ڕێك دەخست و پێش ئەوەی بەرچایی بخوات
پیاسەیەکی دەکرد.
ئەو تازە ئیتر گەنج نەبوو،
ئەوەیشی دەزانی ئێستا ئیتر ئەو کاتەی نییە لە دەستی بدات.

حوکوومەتی تازە تێکەڵاو بوو؛
ڕەش و سپی، هندی و ڕەنگدار،
موسڵمان و مەسیحی و کۆمونیستی تێدا بوو.
تابۆ مبێکی بوو بە جێگری یەکەمی سەرکۆمار.
مبێکی کوڕی یەکێك لە هاوڕێیانی زیندانی ماندێلا بوو.
دی کلێرك، سەرکۆماری پێشوو، بوو بە جێگری دووەمی سەرکۆمار.
گەلێ لە ئەندامانی حوکوومەت زۆر لە ماندێلا گەنجتر بوون.
پێیان دەوت "پیرەمێرد" یا "مادیبا."

ئەرکەکانی حوکوومەت یەکجار زۆر بوون.
هەموو ئەفریقای باشوور دەبوو سەرلەبەر بگۆڕدرێت.
خەڵك دەبوو ماڵی باشتری هەبێت و
پێویستیان بە ئاو و کارەبا بوو.
دەبوو خوێندنگە و چاودێریی تەندروستییان هەبێت.
دەبوو پۆلیس شەڕی تاوانکاری بکات.
دەبوو ڕاستیی تاوانەکانی سەردەمی ئەپارتهاید ئاشکرا بکرێت.
حوکوومەت گرۆیەکی پێك هێنا
ناو نرا کۆمیسیۆنی ڕاستی و ئاشتبوونەوە.



١٠ی مایسی ١٩٩٤، نێڵسۆن ماندێلا بەسەرکۆمار هەڵبژێردرا. لەلای ڕاستیەوە زێنانیی کچی و لەلای چەپیەوە تابۆ مبێکی

ئەو کەسەی لە بەردەم کۆمیسیۆنەکەدا پێی لە تاوانی سیاسیی خۆی بنایە، دەکرا ببەخشرێ.

نێڵسۆن ماندێلا کە گەنج بوو کەسێکی بێتەحەمول بوو، بۆکسێنی دەکرد و ئاخاوتنی هێرشبەرانەی پێشکەش دەکرد.

لە زینداندا فێری تەحەمول بووبوو. دەیگوت:
– مرۆڤی ئازا لەوە ناترسێت لە خەڵك ببووڕێت.



نێڵسۆن و گراچا ڕۆژی زەماوەندەکەیان

## گراچا

ماندێلا زۆرجار تاسەی ڕابوردووی دەکرد، تاسەی ژیانێکی سادە
لە دێیەکەی ساڵانی منداڵیی خۆیدا لە ترانسکەی.
خانوویەکی لە دێی کونودا دایە دروستکردن.

دەیوت حەز دەکات لە کوێ لە دایک بووە، هەر لەوێیش بمرێت.
بەڵام نێڵسۆن ماندێلا جارێکی تریش دنیای تووشی حەپەسان کردەوە.
ئەم جارە گەنجامێزتر و دڵخۆشتر دیار بوو،
دەمێك بوو وا نەبینرابوو.
جارێکی دیکەیش کەوتبووە داوی دڵداری و عەشقەوە.



گراچا ماشێل، خەڵکی مۆچامبیك بوو،
وڵاتێکی دەراوسێی ئەفریقای باشوور و
کچی ماڵباتێکی هەژاری لادێ بوو.
لەناو شەش منداڵدا لە هەمووان بچووکتر بوو،
باوکیشی ماوەیەکی کورت پێش لەدایکبوونی ئەم مردبوو.
گراچا وەزیری پەروەردە بووبوو و
شووی بە سەرکۆماری مۆچامبیك کردبوو.
کاتێ مێردەکەی لە ڕووداوێکی نهێنئامێزی فڕۆکەدا مرد،
ئەم بە تەنیا لەگەڵ هەشت منداڵدا مایەوە.

نێڵسۆن داوای لە گراچا کرد شووی پێ بکات، بەڵام ئەو وتی نا.
نەیدەویست وڵاتەکەی خۆی بە جێ بهێڵێت.
بەڵام زۆرجار سەری لە نێڵسۆن دەدا و
لە سەفەرەکانیدا لەگەڵی دەچوو.
منداڵەکانی نێڵسۆن و نەوەکانی گراچایان خۆش دەویست.
ئەو ٢٧ ساڵ لە نێڵسۆن گەنجتر بوو و
ئەوەندەی ئەو سەختگر نەبوو.
کە لای نێڵسۆن دەژیا ماڵەکە خۆشتر دەبوو و
زیاتر دەبووە جێی حەسانەوە.

نێڵسۆن وتی: من دڵم چووە لە ژنێکی نایاب
بە سایەی ئەو خۆشەویستییە و ئەو پشتگیرییەی ئەوەوە
لە درەنگانی ژیاندا وەك گوڵ دەپشکوێم.
ئەو بەهێزە
من بە تەنیا بێهێزم.

نێڵسۆن جارێکی تریش داوای لێ کردەوە شووی پێ بکات و
گراچا وتی باشە.
لە جەژنی هەشتا ساڵەی نێڵسۆندا زەماوەندیان کرد.
ئەو قەشەیەی مارەی بڕین سەر بە کڵێسای مێتۆدیست بوو.
بەڵام پێش زەماوەندەکە
بەپێی دینی جوولەکە و موسڵمان و هیندوویش
سرووتی پیرۆزیان بۆ کرا.

سالّی ۱۹۹۹ نێلسۆن ماندێلا وازی له دهستهڵات هێنا و
تابۆ مبێکی دوای ئهو وهك سهرکۆمار ههڵبژێردرا.
دیسانیش ماندێلا وهك ههمیشه بهردهوام بوو و زۆر کاری کرد.



خهونی وڵاتێکی پهلکهڕهنگینه، که ههموو مرۆڤهکانی
مافی وهکیهکیان ههبێت
هێشتا نههاتۆته دی.
بهڵام زۆر شت چاکتر بووه.
شهڕی ناوخۆ له ئهفریقای باشوور ڕووی نهدا و
خهڵکی ههژار ئێستا چیی دی وهك کۆیله تهماشا ناکرێن.
نێلسۆن ماندێلا به هۆی خهباتهوه له پێناوی
داد و ئاشتیدا بوو به کهسێکی ناودار له ههموو جیهاندا.
۲۷ ساڵ له زینداندا بوو بێ ئهوهی ببێته مرۆڤێکی کینهدار.
گراچای ژنی دهڵێ: ئهو سیمبۆڵێکه جیهان پێویستی پێیهتی،
هاوکاتیش ئهو مرۆڤێکی ئاساییه به لایهنی بههێز و بێهێزی خۆیهوه.

نێلسۆن ماندێلا لهبارهی خۆیهوه دهڵێ:
من فریشته نیم. من کوڕێکی سادهی خهڵکی لادێم.
ئهوهی من تاسهی دهکهم ئهوهیه لهگهڵ خۆردا له خهو ههڵستێم و
به هێمنی و بێدهنگی بهسهر گردهکانی دێیهکهی خۆمدا، کونو،
بگهڕێم. من ههوڵ دهدهم
نهێنهکانی ژیان تێبگهم.



نێڵسۆن لەگەڵ بنەماڵەکەیدا لە دەرەوەی ماڵەکەیان

# ڕوونکردنەوەی هەندێ ناو و کورتەناو

| | |
|---|---|
| **Rolihlahla** | یەکەمین ناوی نێڵسۆن ماندێلا بە زمانی خۆسا، بە مەعنای "لقی دارێك بشکێنە" یا "شەڕەنگێز". |
| **Dalibhunga** | ئەو ناوەی نێڵسۆن کاتی خەتەنەکردن وەریگرت و مەعنای "دامەزرێنەری بهونگا"یە. |
| **Madiba** | ناوی خێڵەکیی نێڵسۆن ماندێلایە. خەڵکی ئەفریقای باشوور بۆ خۆشەویستی بە کاری دەبەن، هەروەهایش بۆ پێشاندانی ڕێز. |
| **Nomzamo** | ناوی پێشینەی وینی ماندێلا. مەعنای ئەوەی خەبات دەکات و دەخرێتە بەر ئەزموون. |
| **ANC: African Nationl Congress** | کۆنگرەی نیشتمانیی ئەفریقا، ساڵی١٩١٢ دامەزرێنرا. |
| **Cheif Luthuli** | ئالبێرت لوتولی، سەرخێڵی زولو. سەرۆکی ANC بوو ١٩٥٢ – ١٩٦٧، ساڵی ١٩٦١ خەڵاتی نوبێلی ئاشتیی وەرگرت. |
| **Mahatma Gandhi** | خەباتکاری ئازادیخواز و سەرکردەی میللیی هندی. گاندی ساڵانی ١٨٩٣–١٩١٤ لە ئەفریقای باشوور ژیا. |
| **PAC: Pan African Congress of Azania** | ساڵی ١٩٥٩ لە (ANC) جیا بووەوە. |
| **Umkhonto we Sizwe** | ئومخۆنتۆ وێ سیزوێ، "نێزەی نەتەوە" ڕێکخراوێکی عەسکەری بوو، ساڵی ١٩٦١ دامەزرێنرا و نێڵسۆن ماندێلا سەرکردەی بوو. |
| **Inkatha Party** | بزووتنەوەی ڕزگاریی نیشتمانیی فەرهەنگی، ساڵی ١٩٧٥ لەلایەن مانگۆسوتۆ بوتێلێزییەوە دامەزرێنرا. |
| **Amandla** | بە زمانی خوسۆ: دەستەڵات، ئازادی. |
| **Desmond Tutu** | قەشەی باڵا و سەرۆکی کۆمیسیۆنی ڕاستی و ئاشتبوونەوە. |




2000
١٩٩٩: ماندێلا واز لە سەرۆکایەتی دەهێنێت.
١٩٩٨: نێلسۆن ماندێلا و گراچا ماشێل زەماوەند دەکەن.
١٩٩٤: یەکەمین هەڵبژاردنی دێموکراتانەی ئەفریقای باشوور. نێلسۆن ماندێلا دەبێتە سەرکۆمار.
١٩٩٠: ماندێلا ئازاد دەکرێ.
١٩٦٤: نێلسۆن ماندێلا دەبرێ بۆ دورگەی رۆببین.
١٩٦٠: گوللەکانی شارپڤیل.ANC قەدەغە دەکرێت.
١٩٥٨: نێلسۆن ماندێلا و وینفرێد مادیکیزێلا زەماوەند دەکەن.
١٩٥٦: دادگاییکردن دژی خیانەت دەست پێ دەکات. ١٥٦ کەس لە خەباتکارانی ئازادی دەگیردرێن
١٩٥٥: بەیاننامەی ئازادی لە کلیپتاون جاڕ دەدرێت.
١٩٥٢: ماندێلا و تامبۆ نووسینگەی پارێزەری دەکەنەوە.
١٩٤٨: پارتیی ناسیۆنالیست هەڵبژاردن دەباتەوە و حوکوومەتیکی ئەپارتهاید پێك دەهێنێت.
١٩٤٦: هندییەکان هەڵمەتێکی دووساڵە دژی قانوونی گێتۆ دەست پێ دەکەن.
١٩٤٤: یەکێتیی لاوانیANC دادەمەزرێنرێت. نێلسۆن ماندێلا و ئێڤلین ماسێ زەماوەندیان کرد.
١٩١٨: نێلسۆن ماندێلا لە دایك بوو.
١٩١٢ (ANC): لە بلومفۆنتەین دادەمەزرێنرێت.
1900

## پێڕست

